# هەر ڕۆژەی پۆستێک



**هۆنراوە**

**نووسینی: پۆلا سەعید**

Gedichte

Von Polla Saeed

**پێشکەش بەو گەنجە بێدالّدانەی بارانی خەم بە دەنووک لە پەنجەرەی ئایندەیان ئەدات.**

وتەی نووسەر:

کێشەی مرۆڤی مۆدێرن، جیاکردنەوەی خۆیەتی لە سروشت، مرۆڤ بۆ گەڕانەوەی بۆ ناو سروشت، هەوڵی ئەوە دەدات لە نائاگاییدا بژیی. تاکە ڕێگاش بۆ نائاگابوون پەنابردنە بۆ مادده سڕکەرەکان و ئەلکهول. هەموو ئەم هەوڵانەش لەپێناوی ئەوەدایە لە تراژیدیای ژیانی مۆدێرنێتەدا ڕزگاربین. مرۆڤ، کە لە نائاگاییدا بەدەر دەبێت لە خەم و پەژارەکانی ژیان. پەیکەری شەوی مایکل ئەنجیلۆ نموونەیەکە لەو بەڵگانەی، کە بەختیاریی مرۆڤ تەنها لە نائاگاییدایە، بەختیاریی لە نووستندایە. نووستن ئەو کیشوەرەیە، کە بێجگە لە پێناسە فیزیکییەکەی هەتاوەکوو ئێستا هیچ پێناسێکی تری نییە، هەروەکوو چلۆن بەدەر لە شیکردنەوەیەکی فیزیکیی ناتوانین پێناسی مردن بکەین، ئاوهاش ناتوانین پێناسی خەو بکەین. خەو و مردن ئەو جیهانەن، کە مرۆڤ لە تراژیدیا دووردەخەنەوە. مرۆڤ لە مێژووی بوونیەتی خۆیەوە هەتاوەکوو ئێستا خاوەنی لەوێدابوونێکی خەمبار و خاوەن کێشەیە، لە ئادەم و حەواوە بیگرە هەتاوەکوو مرۆڤی مۆدێرنی ئێستا. تراژیدیا لەگەڵ مرۆڤدا لەدایکدەبێت و لەناوچوونی ئەم تراژیدیایەش پابەندە بە مردنی مرۆڤەوە. ئەو مرۆڤانەی ئاگایانە درک بە هەبوونی تراژیدیای خۆیان دەکەن لە ژیاندا، مردنی خۆیان پێویستە. عیسا نموونەی ئەو مەرگەیە، کە کۆتایی بە تراژیدیای خۆی دێنێت و تراژیدیایەکیش لەدوای خۆی بۆ کۆمەڵگای مەسیحیی بەجێدێڵێت. سوکرات نموونەی ئەو تراژیدیایە، کە مەرگی خۆی پێویست بوو. ئەگەر دیۆنیسۆیس بەردی بناغەی تراژیدیای دانابێت، ئەوا عیسا و سوکرات دیوارێکیان لەسەر دروستکردووە. ئەوان ئامادە نەبوون بچووکترین بەرگریی چییە لە خۆیان بکەن، تاکە شتێک، کە ئەوان ویستبوێتیان مردن بووە و هیچی تر نا. ترس لە مردن هەبوونی پێناسێکە بۆ مردن، لێبەڵێ تەنها پێناسێکی فیزیکیی، هیچ کەسێک هەتاوەکوو ئێستا لە مردنەوە نەگەڕاوەتەوە هەتاوەکوو پێناسێکی خراپی مردنمان بۆ بکات، کە شیاوی ترس لێهەبوون بێت. مرۆڤ خەو دەبینێت و پاشان وەک ڕووداوێکی باوی ڕۆژانە و شەوانە لەبیری دەچێتەوە، لێ هەرگیز بیرلەوە ناکاتەوە، ئەو چەند کاتژمێرەی، کە نووستووە لەکوێ بووە؟ بەختەوەر بووە یان نا؟ لەکاتی خەوتنیدا ئاسوودە و بەختەوەر بووە یان لە بەئاگاهاتنیدا؟ کە مرۆڤێک پەنجا ساڵ تەمەنیەتی ئاخۆ تەواوی ئەو پەنجا ساڵە لە ئاگاییدا ژیاوە یان نا؟ ئاخۆ تەمەنمان لە ئاگاییدا دەژمێردرێت یان لە نائاگاییدا؟ کە بە دڵنیاییەوە ژیانی نائاگاییمان بەتەمەنترە وەک لە ئاگایی، ئەمەش وەهادەکات، کە نیووبەش زیاتری تەمەنمان تەرخانکراوە بۆ نائاگایی و ئەوی تری بۆ ئاگایی. کەواتە مرۆڤ خاوەنی تەمەنێکی کورتە بۆ بە ئەقڵاندنی ژیانی، ئەو تەمەنە کورتەش بەشێکی زۆری بە تراژیدیا دەنووسرێتەوە.

ئەوەی لێرەدا باسدەکرێت پابەندە بە ژیانی تاکەوە، ژیانێکی ئیندیڤیدوال. ژیانی مرۆڤێکیش وەک کەسایەتییەکی ئیندیڤیدوال برتییە لە کیشوەرێک پڕ لە خەم و پەژارە و

ئازار. له ڕوانگەی پێتەر سلۆتەردایکەوە، که بۆ پێشەکی چاپه نوێیەکەی ( لەدایکبوونی تراژیدیاکان)ی فریدریش نیچەی نووسیوە دەڵێ: ژیانی باو بۆ مرۆڤێکی ئیندیڤیدوال بریتییە لە جەهەنەمێک لە ئازار، که بۆ ئەو باشترە هەر لە دایک نەبوایە، باشەی دووهەم: زوو بمرێت. ڕستەی دووهەم، ژیان لە ڕێگای سڕکردن و خەوەوە بەسەر ببرێت.*
شاعیر ئەو ژیانە ئیندیڤیدواله بەسەر دەبات، که سەرتاپای ژیانی پڕ تراژیدیا و خەمۆکییه، ئاخر بۆیە زۆرینەیان ئەگەر مەرگیان دەستنەکەوێت، وەک عیسا و سوکرات، ئەوا خۆیان بە دەستی خۆیان ژیان لە خۆیان دەستێننەوە و زوو کۆتایی بەو تراژیدیایە دێنن، که تێیدا دەژیین.
ئەوەی من لەم پۆستانەدا نووسیوومەتەوە بریتییە له بیۆگرافیی بیرکردنەوەیەکی ئیندیڤیدوال، که زۆرجار هەم خەمۆکیی هەم تووڕەبوونی پێوەیە، ساڵنامە شیعرێک، که باس لە ژیانی شاعیرێک دەکات لێوان لێو لە خەمخواردن، باس لە جەهەنەمێک دەکات پڕی ئازارە، باس لە سکاڵاکانی لەدایکبوون و تراژیدیاکانی ژیان دەکات. گەیشتنە بەو باوەڕەی، که بڵێیت: دایە تۆ بۆچیی منت دروستکرد؟ ئەی جەنگ بیست و چوار دانە ساڵی ڕەبەق تێتدا ژیام بۆ نەتکووشتم؟ هەموو ڕۆژێک لانیکەم هەشت کاتژمێر دەنووم، هەشت کاتژمێر مردووم، هەشت کاتژمێر لەم فاکتە پڕ غەدر و هەتککەرەدا نیم، لێرە نیم و ناشزانم لەکوێم، لێدەزانم وەک پەیکەری شەوی مایکل ئەنجیلۆ ئاسوودە و بەختیارم، خەمباریی من لە لەخەو هەڵستاندمدایە، فیزیکیی جەستەم ماتۆڕێکی نەکووژاوەیە و چاوەڕوانی هاتنەوەی ڕۆحم دەکات. لە مردندا ماتۆڕی جەستە فیزیکییەن کوژاوەتەوە، هەنووکە ڕۆیشتنی ڕۆح ڕۆیشتنێکی هەمیشەیییە، ئاسوودەییەکی هەمیشەیییە بەختیارییەکی هەمیشەیییە. هەرچیی پۆستێکیش لە هەرڕۆژەی پۆستێکدا بەرچاو دەکەوێت بۆ خوێندنەوە، گێڕانەوەی بەشێکی ئەو تراژیدیایانەیە، که مرۆڤ وەک لەوێدابوونێکی ئیندیڤیدوال بۆیان لەدایکبووە هەتا تێیاندا بژیی. تراژیدیا ئەو ژانەیە، که لەگەڵماندا لەدایکدەبێت، کۆتایی ئەویش ڕاوەستاوە لەسەر کۆتایی هاتنی ئێمە، وەک تاکی کۆمەڵگا وەک کەسایەتییەکی ئیندیڤیدوال. هەر ڕۆژەی پۆستێک هەم بیۆگرافیی بیرکردنەوەی بەشێکی ژیانی ئاگایی منە، هەم تراژیدیای بەشێکی ژیانی منی نووسیوەتەوە.

* Die Gebut der Tragödie: Friedrich Nietzsche.

02.10.2007

تەپە تەپ لە دەرگای پەنجەرەکەم دەدات
بۆ چرکەیەک چییە چاوی لەسەر پێخەفەکەم لانابات،
لەودیوو پەنجەرەکەوە لەگەڵم ئەدوێت
خۆر سەراپای ڕەنگکردووە
ئاشقێکی تەتەرە لە دووڕا هاتووە،
ڕێکەوتی 01.08.2006ە
کاتژمێر پێنجی ئێوارەیە
بوونم لێرەدا وەک چارەنووسی مەلێکی تەرەیە،
پەنجەرەکە دەکەمەوە لەودیوەوە نامەیەک ئەداتە دەستم
کۆترێکە شەقژنیەتی
ڕەنگی خاک ڕەنگی پەرچەم و قژیەتی،
سڵاو: لەودیووی دیوارەکانەوە
لەو دیووی شتەکانەوە
لەو دیووی ڕاستییە شاراوەکانەوە،
سڵاو: ئەی ئازارە بێ نیشتیمانەکان
نیشتیمانی ئێوە مشتێک خۆڵە
نیشتیمانی ئێوە بووە بە ئاواتی جاحێڵی بێداڵەدە
بە ئازارە پڕ نهێنییەکانی کیژۆڵە،
هەموو ڕۆژێ پۆستێک بدەرە دەست "با"
ئێمە وەڵامت بە هەورەکاندا بۆ دەنێرین
دوو جیهان ئەدەین لەیەک هەتا ئەمیان بێ ئەوی تریان هەڵنەکا،
کۆتر ئەیداتە شەقەی باڵ
لە شیینایی ئاسماندا وندەبێت
دەبێتە هەور دەبێتە شنەی شەماڵی ساڵ،
دەیان ڕۆژ ئەو پۆستەم ئەمدیوو و ئەودیوو کرد
لە دێڕی یەکەمەوە هەتا دوا وشەیم لەبەرکرد،
توانام نەبوو بنووسم
هەرکاتێکیش سەرم دەنایە سەر سەریین
خەونەکانم داوای بەئاگاهاتنەوەیان لێدەکردم،
دەیان ڕۆژ بەسەر ئەو پۆستەدا تێپەڕیی
دەیان شەو خەونەکانم گریان
جارێک چییە پێڵوی تەڕی هیچیانم نەسڕیی،
دەیان ڕۆژ بێدەنگییم هەڵبژارد

دەیان شەو چکلێتە شیعرم
کرد بە نقووڵی شەوی بەرات،
ڕۆژێکیان هەورێک دانەوی و تەویڵی ماچکردم
من سەرتاپام بوو بە تەم
ئەویش هەر ڕۆژەی پۆستێکی لێوەردەگرتم،

01.08.2006

پۆستی ژمارە (1)
22.09.06 هەینیی.

ئێوارەت باش ئەزیزم
بمبەخشە لە ناوەختییم
وەلێ من بەبێ ئەشق ناژییم
ئەشق ئەو ئازارەیە
کە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ گەنجترم دەکات
ئەو وەرزەیە، کە منی شاعیر
وەک ئەنگووستیلە لە پەنجەت دەکات،

پۆستی ژمارە (2)
23.09.06 شەممە

ژیان بێ تاوانە
ئەوە ئێمەین شەلاڵین لە غەدر
تاوان بەشێکی ژیانمانە،
نقوومین لە چاوبرسێتیی
پارە ڕۆح و گیان
ماددە باوەڕ و ئایینمانە،

پۆستی ژمارە (3)

24.09.06 یەک شەممە

وتەی یەکەم:

برسیی و ڕەش و ڕووتی کۆڵانەکانی شار بوون
نەوەی هەژار
کوڕانی تەنگانە و سمکۆکانی شاخ و شار بوون
پاک وەک کانیی، وەک دەغڵ و بژار،
پارت پەروەردەی کردن
پاڵەوانی تفەنگ بوون
لە ڕامان بێبەشیانکردن،
ڕاستیی لاتان دەرچوو بوو
سەرۆک خودا
پارت لە ناپاکیی بەدەر بوو،

وتەی دووهەم:

بەم عانەیە مووچەی هەموو دونیا دراوە*
بە دەستکێشێکەوە دەست دەبەم بۆ ئەم عانەیە
بە قێزەوە پێی پێدادەنێم ئەیخەمە ژێر پامەوە،*
هەمووتان کاڵان بۆ فرۆشتن
هەرکەسێک دێت دەتانکڕێت
هەر سەرکردەیەک دێت قوونی خۆی
بە لاپەڕەی کتێبەکانتان دەسڕێت،
ئێوە کاڵان بۆ فرۆشتن
کڕیارەکانتان پارتە
بێدەنگ بن تا لە بێدەنگییدا دەبنە نەبوو
دەبنە گابەردی فڕێدراوی سەرڕێ
دەبنە گەوارای مێژوو،

*Gedichte: Friedrich Nietzsche ،"کۆپلەیەکە لە هۆنراوەی " کلاگە دێر ئاریادنە
"سکاڵای ئاریادنە"ی فریدریش نیچە، لاپەڕە 94. ئاریادنە بە چەند واتایەک دێت وەک:
یارمەتیی لە"پەیوەندییە ناتەواوەکان، جەنگاوەر، نائارامیی، وەرگەڕان"ەوە.
گەوارا: چاوپۆشیی

پۆستی ژماره (4)
25.09.06 دوو شەممە

ڕەشبینم بەرانبەرتان
بە گفتەتان
بە دەستی میکرۆباویی تەوقەتان،
نەوەی عانەن
وردە بۆرژوای بێ ئەقڵ و
دەردە کووشندەی ئەم گەنجانەن،
خاوەنی کۆمپلێکسی شەرم لە مێژووی خۆتان دەکەن،
نەدیتکەن، مێشک بەتاڵ و
گیرفانتان پڕ لە عانە و
پەنجەکانتان زێرڕێژ دەکەن،
پەسەندتان ناکەم
لەوەتەی هەن ورد و درشتتان
تەپڵی سەرم لێدەدەن
دەمکەنە کۆیلەی سۆزێکی پڕوپووچ
بیرکردنەوەم لە خاچ ئەدەن،
ئێستاش خوێن لە لەپی دەست و
قەد و قاچم ئەڕژێ
خاچەکانم وەک دوێنێ وان
ئازار دڵ و گیانم پێکەوە ئەسمێ،

پۆستی ژماره ( 5)
26.09.06 سێ شەممە

وەسێتمە ئەگەر مردم لاشەم بسووتێنن و بمکەنە خۆڵەمێش
بمدەن بەدەم شەپۆلی ڕووبارێکەوە
ڕێگا بدەن با ڕووبار زووخاوی ژینم بشواتەوە،
مەمگەڕێننەوە دایکی نیشتیمان
نیشتیمانی من ئەو شوێنەیە، کە لێی دەمرم
نەک، کە لێی لەدایکبووم

لەو شوێنەی لێی لەدایکبووم هەرگیز وەکی ئێرە، کە لێی دەمرم
ئارام نەبووم
قەت لەوێ وەکی ئێرە لە نووکی پەنجەی هومانەوە نزییک نەبووم،
ئێچە هۆمۆیەک* بووم سەرا بە سەرا و کۆڵان بە کۆڵان دەیانگێڕام
دەیانشکانم
عیسایەکی لەخاچدراو بووم مەرگی خۆم پێویست نەبوو
وەلێ ئەوان دەیانویست بمرم
دەیان ویست نیگای خوێنی تەوێڵم بکەن و
قاقا پێمپێبکەنن ئەو کاتانەی چۆڕاوگەی خوێنی نێوچەوانم دەسڕم،
دەیان ویست بە دڕندانەترین شێوە ئازارم بدەن
وەلێ بۆم نەبێت تەنیا جارێک چییە دەنگ هەڵبڕم،
ئەمە نیشتیمانی من نییە بەڵکوو قەسابخانەیە
نیشتیمانی من ئەو شوێنەیە، کە لێی دەمرم
ئەمە کۆمەڵگای من نییە، تۆزقاڵەزەڕڕەیەک ویژدان چییە تێیدا نییە،
نیشتیمانی من ئێرەیە، کە لێی دەمرم
لێرە بۆم هەیە بدوێم
بۆم هەیە دەنگ هەڵبڕم،

* ئێچە هۆمۆ: ئەو مرۆڤەی تاجە چقڵیینەی لەسەردایە، مەبەست لە عیسایە، کە پیلاتووس لەکاتی دادگاییکردنیدا تاجە چقڵیینەیەکی دەکاتە سەر و ناوی دەنێت ئێچە هۆمۆ. لە پاییزی ساڵی 1888دا فریدریش نیچە کتێبێک بە ناوی ئێچە هۆمۆوە دەنووسێت.

پۆستی ژمارە "6"
27.09.06 چوار شەممە

سەرسام مەبە وا بەم ئێوارەیە لە دەرگات ئەدەم
هاتووم لەگەڵ پێدانی ئەم پۆستەدا
باجی تەمەنی خۆم ئەدەم،
تەمەنێک پڕاوپڕ لە ئێش
تەمەنێک بۆ پێکەنین زۆر کورت
بۆ گریان ئێجگار درێژ،
نیگام مەکە، کەوا بەم ناوەختە شەلاڵم لە بارانی پاییز
پەڕاگەندەیەکم دڵشکاو

ئاگر لە ڕۆحما کەوتۆتەوە
پۆستێکم پێیە خەمبار و زیز،

پۆستی ژمارە "7"
28.09.06 پێنج شەممە

تەم توومانە
بەرپێی خۆم نابینم
ئازار بە خۆی و قامچییەکەیەوە دوامکەوتووە
خۆشیی لە دەستی هەڵدێت
گوڵێکم تەنراوی شینم،

پۆستی ژمارە "8"
29.09.06 هەینیی

چاو دەکەمەوە قامچیی ژیان لێم دەدات
یەکەم بەیانیی باش لە پشیلەکەی دەرکی ماڵم دەکەم
ترسم هەیە بەم ئازارەوە لەم ڕێیەدا
دڵم چیتر لێنەدات،

پۆستی ژمارە "9"
30.09.06 شەممە

بە ڕێگاوەم بەرەو بۆنکردنی گوڵی ژیان
ڕێگام دوورە و هەڵدەمژم بەرامەی گزنگی بەیان،
کە گەیشتم تەنیا جارێ دەستبخەرە سەر سینەی پڕ گڕم
دارستانێکم لەوەتەی هەم خۆم فرمێسکی چاوانی خۆم ئەسڕم،

پۆستی ژمارە "10"

01.10.06 یەک شەممە

بەخت بۆ من یار نەبوو
ئادەمێکی ئەشکەنجەدراو بووم
کەس وەکی منی سەرسەخت
لە نامرۆڤیی خەڵکیی تووڕە نەبوو،
کەس وەک منی پەروانە
فرمێسک هاوڕێی گوڵی پێڵووی نەبوو،
نیچە فێری کردم خێرا نەبم
دەنا بەلای بەختما تێدەپەڕم
وەلێ منی خاو لەوەتەی هەم
لەسەر ساجی سوورەوەبووی تەمەن هەڵدەپەڕم،
شەڕ لەگەڵ چارەنووسدا دەکەم
لاپەڕەی ڕۆژنامە حەیابەرەکان
بە ڕووی "با"دا دەدڕم،

پۆستی ژمارە "11"
02.10.06 دوو شەممە

ئێوارەیە سەرم دەفی دەستی خەمە
ڕێگام ناکام
تاک و تەنیا هیوام کەمە،
کێ لە دەردی من دەپرسێ
کام دەست کام پەنجە
دڵۆپێ فرمێسکی من ئەسڕێ،
مێشهەنگێکم لەوەتەی هەم بە دەوری گوڵی ژاکاوی تەمەنەوە خول ئەخۆم
پەروانەیەکم هەموو ڕۆژێ بە ئەشکی ڕژاوی شەم
باڵی فڕیینی سبەینێم ئەشۆم،

پۆستی ژمارە "12"
03.10.06 سێ شەممە

کەسێک نییە ئەم پۆستەم لێوەربگرێ
کەسێک نییە تەنیا جارێک گوێم لێبگرێ،

تەقە تەق لە دەرگای دەروونی هەرکەسێکمدا
دەرگایان لێنەکردمەوە
بە باڵەخانەی ویژدانی هەرماڵێکدا هەڵزنام
پەنجەرەیان بە ڕوومدا داخستەوە،
بۆ کەسێک نییە ئەم پۆستەی بدەمێ
لێو بە خەندە ڕووخسار شیریین
بمخاتە سەر ڕێی سەفەرێ،
سەفەرێ لەم پاییزەدا
بمبات بۆ دوورگەیەکی هێند دوور
هەڵمبکێشێ لە ئەشق
باڵاپۆشمبن گوڵی زەرد و سوور،

پۆستی ژمارە "13"
04.10.06 چوار شەممە

لە تارییکییدا بە هەستی سەری پەنجە
ئەیلاوێنم ئەم ژانە گەنجە،
لە تارییکییدا لەگەڵ خەمەکانی خاکدا ئەدوێم
خاک قوربانییەکی زامدارە
چاوەڕێی هاتنی سوارێکە دەریبهێنێت لەم ئازارە،
ئەی خاک چەندیین ساڵە تۆ وایت لە چاوەڕوانیی پاڵەوانێکدا
لە دەربەندی هیچ کیشوەرێکەوە سمکۆیەکت* لێ دیار نەبوو(1)
چەندیین ساڵە بەم هەموو برییینە پەڵەپەڵانەوە
وایت لە تارییکییدا
لە هیچ لایەکەوە چرای یاشێخێکت* لێ دیار نەبوو (2)
ئەخیلێسکت* نەبوو تووڕەبوونت لە سەرکەوتنتا کۆبکاتەوە (3)
پاڵەوانێکت نەبوو ئازادییت لە نەعرەتەیا بنووسێتەوە،
دەیان ساڵە ڕۆڵەکانت بۆ فرۆشتن
لە پێشانگای مێژوویاندا ڕیزکراون
سەرکردە نین کاڵایەکن لە بازاڕی نێونەتەوەییدا هەڕاج کراون،
دەیان ساڵە ئەم مێژووە غەزەب لێکەوتووە هاوار دەکا و دەڵێ: هەڕاج  هەڕاج  هەڕاج
هەڕاجی سەرکردەی کاڵا
هەڕاجی خاک

گۆڕینەوەی ئازادیی بە بەلا،
دەتەوێت بیانکڕیی؟*
هەموویان بۆ فرۆشتنن
وەلێ تکایە زەنگی کیسەی پڕت زۆر لێبدە
دەنا بەهێزیان دەکەیت
دەنا تۆ خوویان بەهێزتر دەکەیت،* (4)

سەرنج:
1ـ مەبەست لە ئیسماعیل ئاغای شکاکە
2ـ مەبەست لە شێخ مەحمودی قارەمانە
3ـ ئەخیلێس: پاڵەوانی یۆنانیی جەنگی ترۆیا
4ـ کۆپلەیەکە لە هۆنراوەی " سکالای ئاریادنە"ی فریدریش نیچە لاپەڕە 99
Gedichte: Friedrich Nietzsche

پۆستی ژمارە (14)
05.10.06 پێنج شەممە

کەسێک نەبوو منی هەمیشە تەزیوو
منی ڕۆح وەک گەڵای پاییز وەریوو،
تەنیا جارێ لە خۆ بگرێ
بە میهرەوە فرمێسکی قەتیسماوی چاوانم بۆ بسڕێ،
لەوەتەی هەم تۆ بە شیشی غەم لەسەر وەجاخی ژان ئەمبرژێنی
ئەی خودا
دەیان ساڵە ئازارێکم ماڵە و ماڵ ئەکەم
بۆ ساتێک چییە دەستت لە بەرۆکی من بەرنەدا،
چیت لێمدەوێ
بێ "خەمی" تەمەنی من، بۆچیی ئەو دڵەت ناسرەوێ،
تۆی ئازاردەر
تۆی پێیەک لێرە و پێیەکیش لەوێندەر،
تۆی دڵڕەقی هەزار سەر،
چیت لێمدەوێ
لێگەڕێ و برۆ
هەموو کەس دەزانێ بە شەڕی هەمیشەیی
نێوان من و تۆ،

ئەی ڕاوچیی پشت هەورەکان*
بەر بەرقت کەوتووم
ئەی چاوە تووڕەکەی پشت هەورەکان
لەویادا کەوتووم
خۆم خواردەکەمەوە، خۆم دەخولێنمەوە
بەدەستی هەموو جەلادە هەمیشەییەکان ئازار دراوم
بە تۆ پێکاوم
ئەی ڕاوچییە دڕندەکە
ئەی خودا نەناسراوەکە،*

* کۆپلەیەکە لە هۆنراوەی " سکاڵای ئاریادنە"ی فریدریش نیچە لاپەڕە 94
Gedichte: Friedrich Nietzsche

پۆستی ژمارە (15)
06.10.06 هەینیی

نەخۆشم، شەکەتم
وەک پەروانە لە تەنیایی خۆمدا خولدەخۆم
"تا" گرتوومی ئای تەمەن پەڕاگەندەیەکی چەند بێکەسم،
کوا دەستێکی میهرەبان بسڕێ ئارەقەی تەوێڵ و گەردنم
شەڵاڵم لە "تا"ی تەنیاییدا
تاساوی دوورەدەستی یاران منم،
هیچ کەس منی نەویست
دایک چاوی ڕقی لەسەرم بوو
باوک دەردەدار
شەقی برا تەوقی ملم بوو،
ئێستاش سافانی تفەکانی دایکم
چارەنووسی ئەم نێوچەوانەم تەڕ دەکەن
ڕەشەبای تفەکانی برا

ئەم مێژووەم ڕەش ڕەنگدەکەن،
کوڕ و دایکی تفن
یەک ڕەچەڵەکتان هەیە
هەردووکتان بەرهەمهێنەری ڕقن،
دایە تۆ دەرت کردم
برا تۆ بە بەردی جوێن و تف
ڕەجمت کردم،
ئیدی چیما پێمنەکەن؟
ساجی سوورەوە بووی کام ڕۆژ ما
پێمماچ نەکەن؟

*سافان: چکەی ئاو، دڵۆپ

پۆستی ژمارە (16)
07.10.06 شەممە

لێتداوم بە دەردی تەزیووی پاییز
بە ئازار خەمبارم دەکەیت
بێکەس و تەنیام
مرۆڤێکم دڵشکاو و زییز،
ئاوزم لێبڕاوە
بیرکردنەوەم هەنگاو شلە
وزەی نیگایەک چییە  تێمدا نەماوە،
لێدراوم
دڵشکاوم من لە ڕێگای ڕۆژگارەوە
گا بەدەستی ئەم بێکەسییە
گا بەدەستی ژیانەوە،
ئاوەزینگمە
ئاوەزینگی هیوا
تەمەنێک چاوەڕێمکرد
شەمێک چییە لەسەر ڕێگام هەڵنەکرا،
بە "با"دا تێدەپەڕم
بە ڕەهێڵەدا دەڕۆم
پەنابایەک شک نابەم

کووخێک نییە بیکەمە چەتری سەرم،

* پەنابا: شوێنێک، کە "با" نەیگرێتەوە
* ئاوز: هۆش
* ئاوەزینگ: گیانەڵلا

پۆستی ژمارە (17)
08.10.06 یەک شەممە

قەت ناتوانی فڕینی مەلێک بە ئاسماندا
بە خێرایی مەلەی ماسییەک لە ڕووباردا بپێویت
تۆ نە ماسییت نە مەل
کۆیلەیەکیت بە نانی دەستی دەستەڵات دەژییت،

پۆستی ژمارە (18)
09.10.06 دوو شەممە

بەنێو کێڵگەی دڵما هەنگاو  هەنگاو گەڕام
جێگاپێیەکی تۆ چییە تێمدا نەدی
بە کۆڵانەکانی شاردا گەڕام لە دەرگای هەر ماڵێکی خەمبارم ئەدا
تۆی دەناسی،
تۆ ئەو دەستەڵاتە بێڕەحمەیت لەسەر سکی کۆمەڵ دەژییت
ئەو سیاسەتمەندارەی بەڵێن ئەفرۆشی و
کۆیلە ئەکڕییت،

پۆستی ژمارە (19)
10.10.06 سێ شەممە

ڕیشۆڵەکان پۆل پۆل بەرەو ئەم وڵاتە ڕووت و قووتە دێن
دێن بۆ گەردنی کریستاڵی بەفری ساڵ ببنە نقێم
منیش لەگەڵ یەکەم ڕووتبوونەوەی درەختی پاییزدا دەڕۆم
هەتا شەختەی دڵڕەقی ساڵ، تەنیا جارێک چییە نەیەتە سەرڕێم،

پۆستی ژمارە (20)

11.10.06 چوار شەممە

هەرگیز هیچ هەورێکی پاییز
وەک من ئاوها چڕ نەبووە
هیچ هەورێک وەک من سەری نەکردووە بە کۆشی
ئاسماندا و گریانی پێخۆش نەبووە،
پۆستێکم پێیە پڕ لە کریساڵی ئەشک
پێی خەجاڵەت دەبێ برا
دەستەوەستان ڕادەمێنێ لەبەردەمییدا خوشک،
ئەی پۆستی خۆڵەمێشیی پاییزی ساڵ
تاساندووەمت بەم بەیانییە
سەراپا بووم بە کۆی زوخاڵ،
بەدەستتەوە هێند دڵپڕم
دەترسم دڵم بەرگەی ئەم خەمە نەگرێ
دەترسم بمرم و دەستی لەرزۆکم جارێکی دی
دەستی چاوەڕێی ژیینم نەگرێ،
پێمخۆشە بگرییم
تەمەنێکە بەم خەمەوە دەژییم
هیچ کەسێک بەرپێڵوی حەسرەتی نەسڕییم،

پۆستی ژمارە (21)
12.10.06 پێنج شەممە

تەنیاترین مرۆڤی دونیا منم
بە درێژترین ڕووباری فرمێسکەوە دەژییم
بە ڕۆژ شەکەتی ژێر باری خەم
بە شەویش ئازارێکی گرتێبەربوو
دەمی قڵیشاوی برینم،

پۆستی ژمارە (22)

13.10.06 هەینیی

قەت چوویتە خەونی مرۆڤێکی تەنیا؟
تەنیاترین خەوبینەری دونیا تەنیاکانن
فڕینیان وەک فریشتەکان تەنیایە
ڕەنگی خەمباری نیگارکێشە دڵشکاوەکانن،
بەقەد تەنیایی خەوبینەرێکی تەنیا، تەنیام
بەقەد فڕینی فریشتەیەک لە تەنیایی خۆمدا ژیام،
دوێنێ شەو بەقەد تابلۆیەک
بۆ تەنیایی خۆم گریام،
تۆ تەنیاجارێک چییە خەوبینەرێکی تەنیات نەدیوە
فریشتەیەکی تەنیات نەناسیوە
تابلۆیەکت لە نیگارکێشێکی تەنیا نەکڕیوە،
هیچ چاوێک تەنیاکان نابینێ
هیچ هەستێک، دڵە شکاوەکان نادوێنێ،
تەنیاکان پۆستەچییەکانیش بزەیەکیان دیاریی ناکەن
ئەوانیش تەنیاجارێک چییە
نامەی ئاواتێک لە سندوقی پۆستەکانیان ناکەن،
هەموو ڕێگاکان بەرەو سندوقی تەنیاکان بە تەم توومان گیراوە
کەس ڕێگاکان ناناسێتەوە
دەمی سندوقەکان ژەنگ گرتوونی
کەس ڕێگای ماڵی مرۆڤێکی تەنیا نادۆزێتەوە،

پۆستی ژمارە (23)
14.10،06 شەممە

پاییز لەسەر لێواری پەنجەرەکەم دانیشتووە
ئاشقێکی سەرەڕۆیە تەمومژی لەباوەش گرتووە،
کەس وەک درەخت ئاشقی پاییز نییە
کەس وەک درەخت بۆ ئەشقی پاییز بێ شەرم نییە،
دوێنێ درەختەکان تەنیا کراسەکانیان بۆ پاییز داکەندبوو
ئەم بایانییە بینیم سووخەمەکانیشیان فڕێداوە
سینەیان تەڕ یەکپارچە بە ماچی پاییز خوساوە،
بەیانییەک دێ دەبینم درەختەکان ڕووت و قوتن

بە گڤەی میلۆدی پاییز سەما دەکەن
بەفری ئەشقی پاییز  لەباوەش دەکەن،
پاییز  ڕۆمانسییترین ئاشقە
وەرزێکی بێ حەیا و شەرم
پڕاوپڕ لە "با"
لێوان لێوی ساواقە،

* ساواق: سەرما و سۆڵ

پۆستی ژمارە (24)
15.10.06 یەک شەممە

پارتی زاڵ دەڵێ: من زۆرایەتییم
من جەماوەرم ئەو منە
من دەنگی شەهیدم
ئەو قڵغانی سیاسەتی منە،
سەرۆک دەڵێ: من نەتەوەم
من خاکم من وڵاتم
ئەوان بەبێ من بوونیان نییە
من بۆ ئەوان پێناسم
نان و ژیان نوقوڵدانە و خەڵاتم،

پۆستی ژمارە (25)
16.10.06 دوو شەممە

لەوەتەی هەین وەک گەنمی نێو دەستاڕ
دەهاڕدرێین
وەک نانی بەجێماوی نێو تەنووری مێژوو
دەبرژێین،
مێژوویەکە بۆ ئێوەی ڕزگارکەر
زەرد دەپۆشین
سەوز دەپۆشین
سوور دەپۆشین
ڕەش دەپۆشین،

کەچیی ئێوەش وەک ئەوان هەتکتانکردین
ئێوەش وەک ئەوان بە چەپڵەڕێزان
بە ستایشی نائاگای نەفامان
دیکتاتۆرێکتان پێدروستکردین،

پۆستی ژمارە (26)
17.10.06 سێ شەممە

نامۆیی بۆشایی نێوان خاک و مرۆڤ نییە
یاخیبوونی ئایندەیە لە مێژوو
بیرکردنەوەیە، سنووری سۆزی بۆ نییە،
من هەرگیز تەبا نەبووم لەگەڵ ئەم نیشتیمانەدا
تەباش نابم لەگەڵ ئەم مەملەکەتی بکووژی ئەقڵەدا
منی نامۆ ئیمڕۆ کارم ئەوەیە
ئەم نیشتیمانە بگۆڕم
خەڵکیی بگریەنم، وەلێ ئامادە نەبم
دڵۆپێ فرمێسکی سەر ڕووی کەسێک چییە بیسڕم،
تراژیدیای تۆ ئەوەیە لە نیشتیمان دووریت
بە کۆڵانەکانی غوربەتدا دەڕۆیت
لەملا سروودی ئەی ڕەقیب بە لاوێک دەفرۆشیت
لەولا ئاڵای کوردستان لە بازرگانێک دەکڕیت،
تراژیدیای من هۆشیارییمە
هەناسەیەکی درێژ لە یاخیبوون
شەڕێکی بێ شمشێری پڕ بەرگرییمە،

پۆستی ژمارە (27)
18.10.06 چوار شەممە

عیسایەک بۆ ئیسلام

بەنەرمەیێ وەرە
لێرە بێ تۆ جیهانێک هەیە بێچارە،

وەرە لەسەر ڕێگا دابگیرسێ
ئەی شەمی میهر
تۆ لێرە بیت کەس دەستی شمشێر ناگرێ،
وەرە بە محەممەد بڵێ:
ئەم هەموو خوێنە بۆ؟
کووشتنی مرۆڤ بۆ ڕەوا بێ
بێ بڕوا بە تاک
مەسیحییش بە کۆ؟
وەرە تفەنگەکان لەدەستیان وەربگرە
غەریزەی کووشتن لە ڕۆحیانا دەربهێنە
ژیان بە ئاشتییەوە شیرینە
با  لانکەی میهر بێت نەک کووشتن ئەم زەمینە،
عیسایەکم دەوێت بۆ ئیسلام
هەر ئیمشەو دەبێت بگاتە لام
با بێت ئاسەواری کووشتن بسڕێتەوە
بە چرای ئاشتیی ڕووناکی بکاتەوە ڕێگام،

# *Jesus for Islam*

## *by Polla Saeed*

***Come again,***
***gently,***
***there is a desperate world here,***
***Come***
***and glow on our paths***
***as a generous moonlight***
***with your presence no hand would seize a sward***
***get nearer and ask Muhammad about all this blood,***
***why killing of human be justified?***
***unbelievers by singles***
***and the Christians by groups?***
***come and take the rifles from their hands***
***take away the impulse of slaughter from their soul,***

***life is sweet inside peace***
***let this world be a habitat of giving not homicide,***
***I wish for a Jesus for Islam***
***I want him to arrive tonight***
***let him come and wash the situates of the killings,***
***let the glow of peace enlighten my path.***

پۆستی ژماره "28"
19.10.06 پێنج شەممە

تەموومژ بەردەمی لێڵ کردووم
بیرکردنەوەش لە تۆ هیوام
ئەی نیشتیمان
سەرمای ساڵ تەزاندوومی
ئازارەکانی تۆش، بیرکردنەوەم
ئەی کوردستان،
بەقەد سروشت بیرت لێدەکەمەوە
لەهەر مەودایەکدا تنۆکێ خوێنت لێبڕژێ
من لێرە ئازارت بە نامۆییم دەنووسمەوە،
هێندەی بیر لە چۆنێتی ژیانت دەکەمەوە
بیر لە خۆت ناکەمەوە
هەتا جارێک دەرگا بە ڕووی خەمێکدا دادەخەم
دەجار دەرگای گۆڕانت دەکەمەوە،
تۆ منت ناردە ئێرە هەتا لەودیوو سنوورەکانی تۆوە
ژیان ببینم
منت نارد هەتا لێرە فێربم بژییم
نەک بگرییم،
منت نارد هەتا لێرەوە بتگۆڕم
فێربم میهرەبان بم
ڕێچکەی سەردەم بشکێنم
نەک ڕق لە مێژوو هەڵگرم،
هێند لە باوەشی تۆدا نامۆ بووم
لێرە بۆ ڕۆژێکیش چییە نەبووم
هێند لە بێشەی تۆدا خەو دزراو بووم

لێرە بۆ چرکەیەکیش چییە بێ خەو نەبووم،

پۆستی ژمارە "29"
20.10.06 هەینیی

تەزیووم بە ئازارێک لەسەری پەنجەی دەستمەوە
ژانێک دێتەدەر
کەس لە دەورم ڕانەوەستاوە
کەس بریینپێچی زامی من نییە
منم بێکەس، منم دەربەدەر،

پۆستی ژمارە"30"
21.10.06 شەممە

بەیانیی زوو بوو، زۆر بە پەلە
هاتم لەگەڵتا قاوەیەک فڕبکەم
بە گڕی بوونت مۆمێک بۆ ڕۆژی تارییکم هەڵبکەم،
لەوێ نەبوویت، ئەی هێز و توانای سبەینانی من
ئەی دڵێک پڕ لە میهر
ئەی شەمی دوور داگیرساو
ئەی بەخشندەتریین ژن،

پۆستی ژمارە "31"
22.10.06 یەکشەممە

لەگەڵ کەوتنەخوارەوەی هەر گەڵایەکدا
هیوایەکم دەمرێت
ئەو شەمەی لە ڕۆحما هەڵهاتووە
ئیمڕۆ وەک خۆری پاییز کز دەسووتێت،

پۆستی ژمارە "32"
23.10.06 دوو شەممە

به تاریکیی ئەوکاتەی شار خەتووە
من دێمە دەرگات ئەی نان
به تاریکیی ئەوکاتەی شار خوانی ئێوارەی ڕاخستووە
من لە دەرگات ئەدەم ئەی خەمی ژیان،
مەودایەک بۆ من نەماوە نیگای خۆر بکەم
بەهەر ڕێگایەکدا دەڕۆم
دەبێت چرایەک لەپێش خۆمەوە هەڵبکەم،
ڕێگاکان هەموو تەنراون
دەرگاکان، دەمەکان، بە کیسەی پڕی پڕ دۆلار بەستراون،
لەم خاکەدا کەم دەرگا کەم دەم ماوە
لێی نەنووسرابێ بۆ فرۆشتن
کەم باڵەخانەی بیر ماوە کیسەهەڵچن نەکرابێ بۆ ئێشکگرتن،
نان مقاشە ژیلەمۆی وشە و کڵپەی دەنگی پێدەگرن
داد دەستەسرە نووکی پۆستاڵ، جێگەپەنجەی تاوانی سەر تفەنگی پێدەسڕن،

پۆستی ژمارە "33"
24.10.06 سێ شەممە

لێگەڕێ بڕۆم
لێگەڕێ، لەوەتەی هەم نانی تەویڵی خۆم دەخۆم،
دێوانەیەکم سەر و ڕیشم
بە جۆگەی تەنیاییی خۆم ئەشۆم،
لێگەڕێ بۆ نان بگەڕێم
لێگەڕێ ئەی ژیان باڵم لێبڕوێت و بفڕم
پێشئەوەی ساڵاوی خەمی نان بێتە سەرڕێم،
با نەبمە خاوەنی نانێک هەژارترێک لە من چاوەڕێیەتی
با نەبمە خۆرەوەی ئاوێک تینووترێک لەمن پێویستی پێیەتی،
نانێک بەسەر ساجی چەرخی شوومەوە نێوچەوانی سووتاوە
مرۆڤێک لێیدەکاتەوە ڕۆحی بە ژانی ژیان
هەناسەی بە چەقۆی غەدر قرتێنراوە،
قوومێک ئاو لە چەناگەی کاردا بووە بە ڕۆژژمێری ساڵ
مرۆڤێک دەمی بۆ کردۆتەوە
لە ئاگری خەمی ژییندا دەسووتێ، ئاواتەکانی بووە بە زوخاڵ،

پۆستی ژمارە "34"
25.10.06 چوار شەممە

دوو پۆلیس دەوریانداوم
لە ڕەنگی قژم دەڕوانن
نیگای بەرگ و باڵام دەکەن
دەڕواننە گلێنە ڕەشەکانی هەرتک چاوم،
لێناگەڕێن بڕۆم
هەنگاوێک چییە بۆم هەڵنایە
خەممە لێرە نەجوڵێم، ببمە ئاه بۆ تۆ و
ئازارێکی هەمیشەییش بۆ خۆم،
بۆچیی دەبێت شێوەی ڕەنگم بەهای بوون و پێناسم بێ؟
پەنجەی دەستنیشان درێژکراوی ڕووم
چاوی گوومان هەمیشە لەسەرم بێ،

پۆستی ژمارە "35"
26.10.06 پێنج شەممە

بۆچیی بۆ من هێند سەختیت
هەناسەم لەبەردەبڕیت؟
بە ئازاردا ڕاومدەنێی
ڕۆژێک فرۆشیاریت مەزادی هیوا دەکەیت
ڕۆژێکیش کڕیاریت
هێزی بازوو و ئارەقەی تەوێڵی سوورەوەبووم لێدەکڕیت،
دەیان ساڵە لەگەڵتا هەنگاودەنێم ئەی ژیان
شەوان بە خەم دەمنوێنی
بۆ بەدەستهێنانی نان
بەری پام دەسووتێنی بەری بەیان،
لەوەتەی هەین بۆ پێوەدانی نان
بە تەنووری ژیانەوە
ئازار ئەدوورینەوە،
هیوا وەک مژدەیەکی هەڵخەڵەتێنەر
لە درەختی تەمەن دەکەینەوە،

شەو نییە خەو بە سبەینێیەکی ڕووناکەوە نەبینن
کەچیی بەیانیان شەڕ لە دەرگای ژیینمان ئەدات
دوکەڵی بارووت سکێچی واقوڕماومان ڕەنگ دەکات،
بەم ڕۆحە بریینداروە
دەیان ساڵە بە شاخی تەمەندا هەڵئەزنێم
دنە بە دنە
گەوە بە گەوە
هەستی تۆڵە لەم ژیانەدا ڕاوئەنێم،
تۆی مرۆڤی ڕێسێنتیمۆ
بەوەشەوە ناوەستیت
خەتا ئەخەیتە ئەستۆم
دەتەوێت هەست بە خەتابارییم بکەم
خەمۆکانە بەژنی هەستی خەتای خۆم بخۆم،
تۆی مرۆڤی ڕێسێنتیمۆ
مەملەکەتێکی لە ڕۆحی تۆڵە
جێپێی خەتا هەڵدەگریت
نەخۆشێکی تووڕەیت، ئێخەی سێبەری خۆشت دەگریت،

پۆستی ژمارە "36"
27.10.06 هەینیی

کاتژمێر پێنجی بەیانییە
چاو خەواڵووم
ماڵەکەم تروسکەیەک چییە تێیدا نییە،
ئەوە کێیە بەم گزنگە تەپە تەپ لە بیرکردنەوەم ئەدات؟
بیکەرەوە پۆڵا سەعید خۆمم
پۆستەچیی ناوەخت
تەڕی بەربارانی ساڵ
شۆڕابەی* تەنیا جێماو و تەزیووم،
بە تارییکیی بێ تروسکە دەرگا لە ڕووی دەکەمەوە
بە گوێچکەی بەتانییەکەم
ڕووخساری تەڕی بەربارانی دەسڕمەوە،
بە دڵێکی گەورەوە پێمدەڵێ: بەیانییت باش
بە دوو چاوی نیمچە داخراوەوە پێیدەڵێم: ژیانت باش،

پۆستێکم پێدەدات و دەڕوات
پاش دوو هەنگاو ئاوڕدەداتەوە و دەڵێ:
ئەمە تەنها پۆستێک نییە
پەیامێکە بە تەمەنی گەنجی ماندووت کراوە خەڵات،
گڵۆپی ژوورەکەم پێدەکەم
پاڵدەنێم بە پشتی جێخەوەکەمەوە
دەست بە خوێندنەوەی نامەکەم دەکەم،
نامەیەکە وەک من لە شەڕی ژیاندایە
وەک منی نامۆ دەستی گیری لە ئێخەی خودادایە،
گوێ لە دەنگی وشەکانی دەگرم و دەڵێ:
ناتەوێت کەس بکووژیی*
تەنیا ئەشکەنجەیان دەدەیت
ئەی ئەشکەنجەی من بۆ دەدەیت؟
ئەی بەختەوەر بە زیان، ئەی خودا نەناسراوەکە
ها  ها ها ها
خۆت دەکەیت بەئێرەدا
بەم نیوەشەوە
چیتدەوێ؟
قسەبکە
پاڵم دەنێیت زۆرم لێدەکەیت
ها! زۆر  بە نزییکیی
گوێت لێمە هەناسە دەدەم
گوێ لە دڵم دەگریت
ئەی دڵپیس
دڵت لەچیی پیسە؟
بڕۆ بڕۆ
پەیژەیت بۆچییە؟
دەتەوێت بێیتە ئێرە
بێیتە ناودڵمەوە
بێیتە ناو نهێنییەکانمەوە
بچیتە ناو بیرکردنەوەمەوە،
ئەی دزە بێچاو و ڕووەکە
دەتەوێت چیی بدزیت؟
دەتەوێت گوێ لەچیی بگریت؟

دەتەوێت ئەشکەنجەی چیی بدەیت؟
ئەی جەللاد
ئەی خودا هەڵواسەرەکە، *

* شۆڕابە: لقی شۆڕی درەخت هەتا سەرزەویی
* بەشێک لە هۆنراوەی "سکاڵای ئاریادنە"ی فریدریش نیچە لاپەڕە 95

پۆستی ژمارە "37"
28.10.06 شەممە

بیست و شەشی ئۆکتۆبەر لە میونشن
کەس نییە لە سازان ئازارچەشتووتر لە ئەوی ژن
مێردێک وێنەی جەللاد بێ دڵ
هەر چەقۆیە دەیکات بە سەر و دڵی ژنەکەیدا
بێئەوەی لە هیچ شتێک بکاتەوە سڵ،
سازان حەسرەتی کوڕە پێنج ساڵانەکەیەتی لەدەست مێردە هەڵدێ
لەوبەری جادەکەوە خۆی دەدات بە ئاوتۆمبیلێکی وەستاودا
ئاخ ئازار جارێکی دی جەستەی دەسمێ،
سازان کەوتووە شەلاڵی خوێنە
مێردە دێت جەستەی سووری بەنزیین پرژێن دەکات
کەس تووخنی ئەم پیاوە ناکەوێت
ئەویش لەسەرخۆ ئاگر لە جەستەی سازان بەرئەدات،
ئاخ ئەوە چەندیین ژنی کورد بەم پاییزە
بە ئاگری شەڕی پیاو بوونە کۆی زوخاڵ
ڕۆژ و مانگم بۆ ناژمێردرێ لێمتێکچووە ڕۆژژمێری ساڵ،

پۆستی ژمارە "38"
29.10.06 یەکشەممە

ئاسمان تەڵخە، دڵم ڕوون
چەند باڵندەیەک بەیانییان لەبەر پەنجەرەی ژوورەکەمدا دەیانخوێن
پاییز ئەوانیشی هەڵفڕان، سەری خۆیان هەڵگرت و چوون،
ئاخۆ ئێستانێ ئەو باڵندانە میوانی بەرپەنجەرەی کامە دڵی بەختەوەرن؟
پاسارِیی ئەشقی کام کوڕ، کام کچن؟
یاخوود هەر ئەفڕن، ئەوانیش وەک من باڵندەگەلێکی بێ هاوسەرن،

پۆستی ژمارە "39"
30.10.06 دوو شەممە

دڵم هێند ناسکە بە "با"ی وشەیەک دەشکێ
گەمە بەو وشانە مەکە
نەبادە مەلی یەکێکیان لەدەستت هەڵفڕێ،
دڵم هێند پڕ زامە بە شەماڵی وتەیەکیش دەکوولێتەوە
دەرگا لەسەر "با"ی وەرز دابخە
با ئەم زامەم سەرلەنوێ نەتەزێتەوە،
ڕۆحێکم هەیە بە وێنەی بەفر لە پاکێتییدا
هەستێکم هەیە بە وێنەی دەریا لە قوڵێتییدا،
بەقەد بەفری ڕۆح و دەریای هەستم خۆشمدەوێی
چرکەیەک چییە لێت دوور نابم
من دەزانم ساتێک چییە بێ من ناسرەوێی،

پۆستی ژمارە "40"
31.10.06 سێ شەممە

دەتوانیت کلوو کلوو بەفر بژمێریت؟
ئەو ڕۆژەی توانیت دڵنییا دەبم
کە دەشتوانیت قەلەڕەشکەی سەر کورسیی دەستەڵات
لە خۆت بتۆرێنیت،

پۆستی ژمارە "41"
01.11.06 چوارشەممە

سەرسامیی من لە دەنگهەڵبڕیینمدا نییە
بەڵکوو لە بێدەنگییمدا
لە چرکەساتی ئارامیی و
لە هێمنییمدا،
خەمباریی من لە گریانمدا نییە
بەڵکوو لە کپییمدا
لە گۆشەگیریی و
لە پیاسەی ئێوارانی باخەکانی سەر ڕێدا،
ئاسوودەیی من لە قاقای پێکەنینمدا نییە
بەڵکوو لە نیگای بێ وتەمدا
لە بۆنکردنی ژیان و
نان و ئازادیی کۆمەڵدا،

پۆستی ژمارە ( 42)
02.10.06 پێنج شەممە

بۆنێک بدە لە خۆت
ئاوی ڕۆحم بدات
گوڵی لێوت ڕەنگێک بکە
سەما لەگەڵ چاوما بکات،
چەند بۆنخۆشیت ئەو ساتانەی
بۆنیرژێنی سینەت دەکەیت
چەند جوانیت ئەو کاتانەی
لەبەر خۆردا پرچی درێژت شانە دەکەیت،
وەرە سەرسامم بکە بە بۆنی سینەت
مەستم بکە بە چاوی پڕ ماسکارا
بە ڕەنگ و شێوەت،
وەرە ئاوێزانت بم
حەیرانی جوانیت
میوانی سینەی بۆنخۆشت بم،

مەست مەستم بە بۆنت گوڵم
ئاشقم بە سەدای زێڕیینت دڵم،
وەرە دەستم بگرە بمبە لای خۆت
مەرجە قەت جێتنەهێڵم
سوێند بە چاوت
بە قەوسی برۆت،

پۆستی ژمارە (43)
ڕێکەوتی 03.11.06 هەینیی

بەرەبەیانێکی پڕ تەمومژ
هێشتا خێر و شەڕ بەشنەکراوە
مەلی ڕەش و سپیی دەنووکیان لە دەنووکی یەک نەئاڵاوە
ئەسپی ڕەش و سپیی حیلە و سمکۆڵیان نە ڕسکاوە،
کەچیی لەم بەرەبەیانەدا سێ منداڵ
سێ هەناسە، سێ ترپەی لێدانی دڵ، سێ گروگاڵ،
هێشتا چاویان نووقمی دەریای خەوە
هێشتا جەستەیان دیلی بێدەنگیی شەوە،
بە دیمەنێک ڕادەچڵەکێن
بە جریوەیەک سڕدەبن دەتاسێنرێن،
جریوەی بولبولێکی نێرینە بۆ مەرگی مێینەکەی
جریوەی بولبولێکی کۆستکەوتوو بە مردنی دڵدارەکەی،
بولبول بە دەوری لاشەی سڕی دڵدارەکەیدا خولدەخوات
دیمەنێکی جەرگبڕە، بولبول بە مەرگی دڵدارەکەی مردنی خۆی ئاوات دەکات،
هەرسێ منداڵ فرمێسکی قەتیسماوی چاوانیان
سپییبوونی ڕەنگی ڕووخساریان
خێرالێدانی ترپەی لێدانی دڵیان
لە گریانێکدا ڕەنگدەکەن
تابلۆیەکی چەند خەمبارە
سێ منداڵن بۆ مەرگی بولبولێکیان بە گریانەوە
دەست لە ملی یەکتر دەکەن،

پۆستی ژماره (44)
شەممە 04.11.06 کاتژمێر 18:00

ئەگەر ئەم "با"یە جەستەم بتەزێنێت
تۆ ڕۆحم ئازار دەدەیت ئەی دەستەڵات،
بوویتە خودای ئەم خاکە
هەرچییەک دێت لە گێلییدا
خۆیت دەکاتە خەڵات،
تۆ خودای گێلەکانیت
ئەوان بەبێ تۆ هیچن
تۆش بەبێ ئەوان سیاسییەکی نادیار و سەرگەردانیت،

پۆستی ژماره (45)
شەممە 05.11.06 کاتژمێر 09:55

کێ گەرمم دەکاتەوە؟*
کێ هێشتا خۆشی دەوێم؟
دەستی گەرمم بدەنێ
دڵێک لە کوانووم بدەنێ،*
ئەو کاتانە هەرچییەک هات تەزاندمی
هەرچییەک هات قاقا پێمپێکەنی
بە زیندوێتیی مراندمی،
ئەمێستا نامەوێت کەس لە دەورم بێ
گەرەکمە تەنیا بمرم
دەمەوێت سکاڵای ئاریادنە هاوڕێی ژین و مەرگم بێ،
زانابە ئاریادنە...*
تۆ گوێت نییە، تۆ خاوەنی گوێی منیت
وشەیەکی ژیری تێبکە
ئاخۆ مرۆڤ پێویست نییە سەرەتا ڕقی لە خۆی بێت
ئەگەر بییەوێت خۆی خۆشبوێت؟*
من هەموو ئەوکاتانەی کارێکم کردووە لێی پەشیمان بووم

ڕقم لەخۆم بۆتەوە
هەموو ئەوکاتانەی بۆ جاری دووهەم هەمان هەڵەم نەکردووە
سەرلەنوێ خۆم خۆشویستۆتەوە،
هەنووکە تەنیام، تەنیا ... تەنیا
خاڵی خاڵییم لە هەموو هەستێکی لێبوون
وادەزانم لەپڕێکدا لە نێوەندی کێوییترین جەنگەڵدا
بە فڕێدراویی لەدیکبووم
نازانم چییم ناوە
وەلێ دەزانم، کە بێکەسم
دەزانم، کە لەم جەنگەڵەدا درەختێکی بێلایەن چییە شک نابەم
بیکەم بە چەتری سەرم،
من ئەو نەمامە سووتاوە بێداڵدەیەم
لەوەتەی بیرم بێت بە گڕەوە ڕادەکەم
کەچیی کەسێک چییە فوویەکی لێنەکردووم
ڕێبوارێک چییە قوومێک ئاوی کووژاندنەوەی پێدا نەکردووم،
لەو دارستانە چڕەدا هەموو سووتان
تاکە نەمام من بووم خۆم هەڵکێشا
زمانی درێژی ئاگرم لە بندا قرتان،
هەنووکە درەختێکی قەد ئەستووری باڵاکردووی گڕاوییم
هەمووتان بەم گڕەوە دەمدوێنن
بەم گڕەوە ڕقتان لێمە، خۆشتان دەوێم
کەستان سووتانی هەمیشەییی من نابینن
ئاخ تەمەن هاوارێکی چ بێدەنگ و چ سیحراوییم،

* بەشێک لە هۆنراوەی "سکاڵای ئاریادنە"ی فریدریش نیچە لاپەڕە 94
* بەشێک لە هۆنراوەی " سکاڵای ئاریادنە"ی فریدریش نیچە لاپەڕە 97

پۆستی ژمارە (46)
ڕێکەوتی 06.11.06 یەکشەممە کاتژمێر 06:00

**لێم مەپرسن بۆچیی گریام**

بۆچیی تەمەنێک منی تەنیا بێکەس ژیام،
لێم مەپرسن بۆ لە ناڵەی نەی غەمگینترم
پەڕاگەندەیەکی خەمبار
لە درەختی ڕووتەڵەی پاییز تەنیاترم،
تۆ ئەی چاوی پشت هەورەکان
ئەی سێبەرێک بە بوونمەوە، چییت لێمدەوێت؟
بەم بەیانییە دەتەوێت ئازاری دڵم بدەیت؟
بیدە ئازاری ئەم دڵە شەکەتەم
کزە هەستێنە لەم سینە پڕ ئاخ و نەگبەتەم،
تۆ ئەی خودا دڵڕەقەکە
ئازارمبدە تا ئەو کاتەی ئاسوودە دەبیت
خودایەکی هەمیشە لەگەڵ ئەشکەنجە و ژانی خەڵکدا ئارام دەگریت،
بیدە ئازاری ئەم دڵەم
بەم بەیانییە، کە هێشتا تارییکیی و ڕووناکیی جیانەکراونەتەوە
جەستەم بە ئازار بۆ دەشۆیتەوە؟
من لەگەڵ ئەم ئازارەشدا ڕادێم
هەموو ژانێک دەکەم بە چرای سەر ڕێم،
ئازارێکم بە ئەشقەوە دەڕۆم بۆ ناو لانکەکەم
بە ئازاری تۆ ناتلێمەوە
بەڵکوو بیردەکەمەوە
لە بێکەسیی خۆم
لە چاوەڕوانیی هاوسەرەکەم،

پۆستی ژمارە (47)
ڕێکەوتی 07.11.06 دوو شەممە

با دەردت لە من کەوێ
با نەبینم ڕووی ماتەمت
پێمخۆشە لێوت گوڵی خەندە بگرێ،
خەمبارمەبە با سکێچی ڕووت نەشێوێ
دڵتەنگ مەبە با گەرووت ئاوازی پێکەنیینی لێنەبڕێ،
پێبکەنە ژیان لەگەڵتا ئاڵتر دەبێ
وەلێ تاکە جارێک ئەگەر خەمبار بیت
تەنیا گەڵای فرمێسکی خۆت هەڵدەوەرێ،

ئیدی بۆچیی ئەم پرسەیە؟
لەسای چییە گوڵ ناگرێ باخی لێوت؟
ئیتر بەسیەتی ئەم ناڵەیە،

پۆستی ژمارە ( 48)
ڕێکەوتی 08.11.06 سێ شەممە کاتژمێر 10:00

چۆن بتوانم بیرت نەکەم
کە لەگەڵ هەر چرکەیەکدا هەناسەیەکم بیت
کە تۆ لە هەموو گێژاوێکی نێرییەندا دەستم بگریت،
دەستم دەگریت و بە ژیانم دەسپێریت
هەناسەم پێدەدەیت تنۆکی گریەی سەر ڕووم دەسڕیت،
دێم بزەیەک بە ژیانت دیاریی بکەم
دێم چرای بوونت لە تارییکیی ژییەنمدا هەڵبکەم،
شەکەتم بەم تەمەنەوە
وێرانم بەم هەموو دەرد و خەمەوە،
دێم تا کەمێک خەمەکانم لەلای تۆ کەمبکەمەوە،

پۆستی ژمارە ( 49)
ڕێکەوتی 09.11.06 چوار شەممە کاتژمێر 12:05

ڕەساسیی

بەرەبەیان زۆر زوو تەماشای دەوری خۆم دەکەم
ژیانێک یەکپارچە ڕەساسیی دەبینم
دڵم چەند جارێک خورپە دەکات
تێدەگەم ئەم ڕەنگە هەم ترسێنەرمە هەم ژیینم،
بیردەکەمەوە
بیر لە ڕەنگی تابلۆکان دەکەمەوە
تابلۆیەک بەبێ ڕەساسیی
تابلۆیەکە بێ ڕووناکیی
تابلۆیەک لەگەڵ ڕەساسیی
تابلۆیەکە ژیان هاوڕێیەتی،

به ناوەندی شاردا ڕێگا دەبڕم
چەند قات لەبەریک ڕەنگ ڕەساسیی
قژ ماش و برنجیی
لەگەڵ ڕێبواراندا دەپەیڤن
خەڵکانێکن بیرۆکراتیی،

پۆستی ژمارە (50)
ڕێکەوتی 10.11.06 کاتژمێر 12:00

تووڕەمەبە با "با"ی خەمێک لە دڵتا هەڵنەکات
نیگەرانمەبە تا تۆ غەمگیین بیت
گوڵی قاقا لە تەمەنتا چرۆ ناکات،
بە پێکەنین بژیی
بە ئەشق هەناسە بدە
شەوان بە ئەویین دەتنوێنم
بەیانییان بە مژدە هەڵتدەستێنم،
تیشکێک دێنمە ژیینتەوە
خەندەت پێدەبەخشم
فرمێسکەکانت لێدەستێنم،
تووڕەمەبە لە گووفتارم
کێ دەڵێ: سبەی بۆ تەمەن هەڵدەکەم مۆمێکی تر
پەڕاگەندەیەکم هیچ کەس شکنابەم لەخۆم مەلەکتر،
یارۆ تەمەن دوورگەی گوڵە
گوڵ کێی هەیە لە پەپوولە زیاتر؟
کێ پەلاسی نێودەمی گوڵی مژیوە
لە هەنگ زیاتر؟
تووڕەمەبە من لە مێژە پەنجەرەیەکی کراوەی بەر ڕەشەبای ئەم ژیانەم
مەلێکی تەرەی ناوەخت
قامیشێکی سەر ڕێ و کوون تێکراوم،
هەر چقڵێک "با" دەیهێنێت دەچەقێتە هەست و هەناوم
منی قامیش لەو ڕۆژەوە دەستێک نەیگرتوومەتە خۆی
ئازارەکانم بژەنێ
شەماڵێک تێیدا هەڵنەکردووم

گۆرانییەک تێمدا دەنگ هەڵبڕێ،

پۆستی ژمارە (51)
ڕێکەوتی 11.11.06

لەسەر پەنجەرەکەمەوە دەڕوانمە سرووشت
هەتا ئەوپەڕی چاوبڕکردن
چاوەکانم دەنووقێنم بیرت لێدەکەمەوە
هەتا سنووری درکپێکردن،

پۆستی ژمارە (52)
ڕێکەوتی 12.11.06

دەڕۆم ئەم شارە بەجێدێڵم
یادگاری ڕۆژگارێکی شووم
بە مێژووی ئەم شارە دەسپێرم،
ئاوگسبورگ: ساتێک چییە تێتدا بەختەوەر نەبووم
جەللادی ڕۆحم بوویت، مەرجە وەها لەبیرت بکەم
وابزانی ڕۆژێک چییە تاکێکی دانیشتوانت نەبووم،

پۆستی ژمارە (53)
ڕێکەوتی 13.1106 کاتژمێر 20:30

هەتا هەتایە لەگەڵتا یەکن
دکتۆرەکەت، شاعیرەکەت، هاوڕێکەت،*
لەگەڵ تۆشدا دەمرێت ئەی مرۆڤی بەد
ناوبانگ و سەروەت و سیستێمەکەت،
سارانیشتم لێدەرچووە لەتاو نەبوونی هاوڕێ
هەموو تەمەنم سائەقلێ* بوو
لە ئارانیشدا* مرۆڤێکم لێ پەیدانەبوو
بە ئارهانی* تەمەنم پێنەکەنێ،
هاوڕێییەک چییە شک نابەم
لە سارەدا* هانا بۆ هیوا

لە زەردەپەڕدا دەم بۆ جامی خەم دەبەم،
هیوا دونیایەکی هەڵخەڵەتێنەرە
چاوەڕوانییم درەختێکی چەپەر و بێ سێبەرە،
هیوا و چاوەڕوانییم قەت یەکنەبوون
ساڵانێکی درێژ ئازارێکی بەر باگرۆ*
مرۆڤێکی بشۆرە* بووم،
لەگەڵ من "شیللەر" بێجگە لە شیعر
کەسی تر یەک نەبوو
ئەو دکتۆرەی ئیمرۆ دەچوومەلای
مانگی ئایندە بە دیدارم شاد نەدەبوو،
ئەو هاوڕێیەی هاونشینی دیوانی قاقا و پێکەنینم بوو
لە گریاندا میوانم نەدەبوو،
ئەوەی جێینەهێشتم شیعر بوو
ئەوەی ناپاکیی لێنەکردم جریوەی ژەژەری واتاکانم بوو
ئەوەی لە تارییکییدا تەنیا جێیهێشتم هاوڕێکەم بوو
ئەوەی لەو ئەنگووستەچاوەدا چرایەکی خەڵاتکردم
ڕێبوارێکی سەر ڕێ، مرۆڤێکی نامۆ بە منی کورد بوو،

وتەیەک لە "فریدریش شیللەر"ەوە بۆ "کرستیان ڤێکەرلین"ی هاوڕێی 1778، لاپەڕە 188
Gedichte und Balladen: Friedrich Von Schiller
* سارانیشت: دەشتنشیین، چۆڵپەرست
* سائەقڵ: نەفام
* ئاران: شوێنی زستانەی کۆچەران
* ئارهان: ئێشی ئەندامی جەستەی سووتاو
* سارە: بەرەبەیان
* باگرۆ: "با"ی تووند
* بشۆرە: خەمی زۆر گران، کە مرۆڤ هەراسان دەکات

پۆستی ژمارە (54)
ڕێکەوتی 14.11.06

تۆ وەک من نیت
من کوڕی بیرکردنەوەم

تۆش هۆگری زێڕ و پارەیت،
من لەگەل وشەدا سەما دەکەم
تۆش دڵڕەقێکی شاراوەیت،
من وەک تۆ نیم
تۆ لە پێکەنین و شایی دا دەژیی
من سێبەری خەم و پەلوپۆی ژانم،
تۆ لەگەڵ پارەدا گوزەر دەکەیت
منیش هەر شاعیرەکەی جارانم،
ئێوە کەستان وەک من نین
هەمووتان کوڕی عانە و بەزم و خۆشیین
منی پەڕاگەندەی تەزیوویش
بوومەتە هاوڕێی خەم و شین،
ڕۆژێک چییە دڵتان لام نەبووە
جارێک چییە هەستێکی پاک میوانتان نەبووە،
پێدەچێت میهرەبانیی جارێک چییە نەیدیبێتن
بۆیە دەمەوێ لەبیرتان بکەم هەروەک ئەوەی نەبووبێتن،

پۆستی ژمارە (55)
ڕێکەوتی 15.11.06 کاتژمێر 19:20

من پۆستەچییەکی درەنگ وەختم
کەی بمەوێت لە دەرگای ماڵت ئەدەم
ئەگەر باران بێت چەترێک بۆ پۆستەکەت هەڵئەدەم،
ئەگەر بارەش بێت پۆستەکەت لەنێو بەرگم ئەنێم
بە "با"دا تێدەپەڕم تەرزە و باران بووەتە جێگا و ڕێم،
من چ شتێکی دی شکنابەم بەدەر لە پۆست
لەبەر ئەم سەرمای ئێوارەیەدا ڕاممەگرە
دەرگام لێبکەرەوە ئەی دۆست،
هەر ڕۆژەی پۆستێکت لە ناوەختدا بۆ دێنم
خەندەت پێدەدەم، خەم و گریەت لێدەستێنم،
کاری من ئەوەیە پۆستەکانم بگەیەنم
فێرت بکەم پێبکەنیت، تەنیا جارێک چییە نەتگریەنم،

تۆ پێکەنینت بیرچۆتەوە
دەروونت یەکپارچە زووخاوە
لەوەتەی هەیت تەنیا جارێک چییە نەتشتۆتەوە،
کاری من ئەوەیە گریانت لەبیربەرمەوە
فێری کێشانی وێنەی گوڵت بکەم
ڕەنگی ژیانت بە بەردا بکەمەوە،
هەموو ڕۆژێ درەنگانێ دێم
هیچ هێزێک نییە لە هاتنم بۆ لای تۆ ڕامبگرێ
ئەگەر لەشکری کێرد و چەقۆش هاتۆتە سەر ڕێم،

پۆستی ژمارە (56)
ڕێکەوتی 16.11.06 کاتژمێر 11:25

دڵێکم هەیە تەزیوو و زیز
کەس لە ئازارم ناپرسێ
تۆ گەرمم بکەوە ئەی خۆری پاییز
وەک گەڵای سەرێی گردەوەبوو
وەک مەلی خۆهەڵخستووی بەرتیشکت بە ڕێیز،
هێزێکت پێداوم لە بیری ناکەم هەرگیز،
باوەشی گەرمی بێ نەوایان تۆیت ئەی خۆر
گڕبەردە لە سەهۆڵبەندانی ساڵ
ببە بە چرا بۆ ژووری تاریکی دڵەی پڕ ناسۆر،

پۆستی ژمارە (57)
ڕێکەوتی 17.11.06

کچەکەت ئیمڕۆ دیواری بەرلینی ژیینی شکاند
بەسەر ئاگردا تێپەڕی
سنوورەکانی ترسی تێپەڕاند،
کچەکەت تەنها منداڵێکی نۆ ساڵانە نییە
ویستێکە بەرەو هێز مل دەنێ
ڕاوەستانی لەلا نییە،

کێ هەیە بەو تەمەنەوە ئێخەی دێو بگرێ؟
ڕێی گەڕانەوەی ماڵ بگرێتەبەر
هیچ هێزێک نەتوانێت ڕایبگرێ،
خۆزیا کچانی جاحێڵ و منداڵمان وەک کچەکەی تۆ دەبوون
ڕەشەبایان هەڵبکردایە ئەوکاتانەی لە پیاوی دڕندە
لە باوکانی گەلۆر تووڕە دەبوون،

پۆستی ژمارە( 58)
ڕێکەوتی 18.11.06

بەم بەیانییە زووە پۆستەچییەک لەبەردەرگا ڕاوەستاوە
دەزانم ئەویش وەک من لە بیرکردنەوەدا خەوی زڕاوە،
سندوق بە سندوقی هاوسێکان دەگەڕێ
بۆ هەر یەکێکیان پۆستێ دەهاوێ،
هەستە لە خەو دڵم با  بە تەنیا پۆستی ئەم بەیانییە وەرنەگرم
ئیمڕۆ دڵم زۆر  تەنگە ترسم لە وەرگرتنی پۆست هەیە
چ شتێک شک نابەم پێڵوی تەڕمی پێبسڕم،
دەزانم لێرەوە بۆنی زەرفی پۆستەکە دەکەم
لێرەوە هەست بە ئازاری پیت و وشەکان دەکەم،
کێ دەزانێ لە کوێی تری ئەم دونیایەدا
ژنێک بۆتە خۆراکی چەقۆ
دەنگی نەگەیشتووە بە کەس
هانای نەگەیشتووە بە تۆ،
دەزانی ژنانی ئێمە چەند تەنیا دەمرن؟
دەزانی ژنانی ئێمە چەند بێکەس دەگریین؟
تەنیا دەمرن گوڵ لە ژیانیاندا چرۆ ناکات
بە چاوی پڕ لە گریەوە هاوار بۆ ژیان دەکەن
دەستی هانای هیچ خواوەندێکیان پێناگات،
بەم بەیانییە بۆنی مەرگی ژنێک دەکەم
دڵم وەختە لە سینەم بێتەدەر
هەست بە دواهەمیین ترپەی لێدانی دڵی دەکەم،
ژنێکی کوردە بێکەس لە خوێنی خۆیدا کەوتووە
کۆرپەکەی لە پشت سەریەوە گاڵەیەتی

بکووژەکەی چەقۆکەی لەسەر سینەی جێهێشتووە،

پۆستی ژمارە (59)
ڕێکەوتی 19.11.06

هەستە لە خەو گوڵم
یەکپارچە گوڵوگوڵزارە ئەم بەیانییەماڵی دڵم،
بەیان بۆ ژیانت پێدەکەنێ
پاساریی بەیان جریوە بۆ تەمەنت ئەچڕێ،
من ئەگەر بەیانیان بۆنی گوڵی تۆم هەبێ
ژیینم لە خەم خاڵیی دەبێ
بوونم پڕ مانا
بیرکردنەوەم خونچەی سووری ژینت دەگرێ،

پۆستی ژمارە (60)
ڕێکەوتی 20.11.06

شەست ڕۆژە ئەم پۆستە ماڵە و ماڵ دەگێڕم
کەسێک نییە لێم وەربگرێ
دوکان بە دوکان سڵاو دەکەم
کەچیی کەسێک نییە گوێم لێبگرێ،
مزگەوت بە مزگەوت
میحراب بە میحراب گەڕام
بێهوودە بوو سووانی پێم
خۆراکێ بووم لەم هەوارەدا هەزم نەدەکرام،
ئێخەی زۆر سەرۆکم گرت
قسەی دەرپەڕیووی زۆر سیاسەتمەندارم کەرت کەرت کرد،
کەسیان ئەم پۆستەیان لێوەرنەگرتم
هەموو دەیانگووت نێنەرەکەی نەناسراوە
هەموو دەیانگووت باروودۆخەکە ناسکە

ئەم وڵاتە بە تەلی دڕکاویی ئاشووب تەنراوە،
لە قاوەخانەیەکدا
لە قووژبنێکی دوورە دەستی پشتەوەدا،
لەگەڵ قاوەیەکدا خەمم دەخواردەوە
پیرەمێردێک تێیدەڕوانیم
من بۆ ئەو ڕۆژنامەیەک بووم
لە بنی پێ هەتا تەوقی سەر دەیخوێندمەوە،
بە دەنگێکی گڕی بارییک پرسیی
بۆچیی ماتیی؟
وتم شەست ڕۆژە ئەم پۆستەماڵە و ماڵ
بارەگا و بارەگا
وەزارەت بە وەزارەت دەگێڕم
کەس لێم وەرناگرێ
دەستەکانم ونبووی ڕێگای ئەم پۆستەن
کەچیی کەس تەویڵی خۆڵاوییم ناسڕێ،
لە دەرگای سەرۆکمدا نێنەری پۆستەکەی نەدەناسیی
نێنەر وێردی سەر زاریان بوو
لە ڕاستییشدا دوژمنی باوک کووشتەیان دیموکراسیی بوو،
دیموکراسیی کلتوورە بۆ مترووربەکردن دەشێ
بەخت ڕەشە ئەو گەلەی کچی خۆی نەدات بە کوڕی ئەم کلتوورە
یان کچی دیموکرات بۆ کوڕی ناسیۆناڵی خۆی نەخوازێ،

پۆستی ژمارە (61)
ڕێکەوتی 21.11.06

ئەوی لەم خاکەدا بەهای نەبێت مرۆڤە ئیمڕۆ
سیاسەت ڕەنگ و ڕووی وڵاتی گۆڕیوە
ئەو کورسیی دەستەڵاتە خوێنی شەهیدە
ئەو کۆشکانەش قووتی دەمی تۆ،
ئەوی بەختەوەرە یان شێتە یان خەوتووە
ئاخر بۆیە ئەم خەڵکە ڕەنگ و ڕووی پەیکەری شەویان* گرتووە،

*پەیکەری شەو: دروستکراوی مایکل ئەنجیلۆ باس لە نەهامەتییەکانی سەدەی شانزدەهەمیینی ئیتالیا دەکات.

پۆستی ژمارە (62)
ڕێکەوتی 22.11.06

لەم قەیرانەدا بۆ کوێ دەچیت؟
بەسەر باڵای وشکداگەڕاوی کام گوڵدا باز دەدەیت؟
پەلاسی نێودەمی کام دەنگی هەڵنەبڕاو  ماچدەکەیت؟
ئەوی تۆ پێویستتە هەنووکە ڕاکردنە
ڕاکردن لەپێناوی ژیاندا
ژیان لەپێناوی وتندا،
ژیان بێ وتن واتای نییە
واتاش بێ وتن وڵاتی نییە،
ڕاکە ئەم وڵاتە بستە زەمینێکی بۆ واتاکانت تێدا نییە
تۆ ئەگەر دەتەوێ بژییت وڵاتێک بۆ واتاکانت چێبکە
چونکە بوونت بەبێ وتن هیچ واتایەکی نییە،

پۆستی ژمارە (63)
ڕێکەوتی  23.11.2006 ئاوگسبورگ

هەنووکە هەڵدێم لەدەست گشت شت
لەدەست غەدری گەورە و بچووک
لەدەست ناپاکیی ورد و درشت،
دەڕۆم لە دەستی غەم هەڵدێم
دەگەڕێم بۆ واتایەک بیکەم بە ملوانەکەی ملم
بیکەم بە چرای سەر ڕێم،

پۆستی ژمارە (64)
ڕێکەوتی 24.11.2006 نورنبێرگ

بە جەستەیەکی پڕ گڕەوە
دیسان تەنیا دەسووتێم
بە دوو چاوی پڕ ئەشکەوە

دیسان هەر تەنیا دەگرییم،
ناهەقن ئەوانەی دەڵێن خودا تەنیایە
خودا لە بێکەسییدا خۆی قەیسەرە و خۆی پاشایە،
خودا بکەری گشت تاوانەکانە
دروستکەری گشت غەمەکان
ناهەقییکەری ئادەم و حەوا
نێنەرەوەی شەڕی ژیانە،
هەنووکە ئەوەی تەنیایە منم نەک خودا
ئەوەی یەکپارچە لە غەمی خۆیدا دەسووتێ منم
پەڕاگەندەیەکی بێکەس و بێ تکا،

پۆستی ژمارە (65)
ڕێکەوتی 25.11.2006

گەیشتوومەتە سەر ترۆپکی گۆشەگیریی
تاویک دەژییم دوور لە غەم
دەبمە هاوڕێی بیرکردنەوە
هاکا ڕۆژێک بۆ ئێوە داگیرسام هەروەکی شەم،

پۆستی ژمارە (66)
ڕێکەوتی 26.11.06

تەمومژە بەرپێی خۆم بە ئاستەم دەبینم
ئەوەی لێمەوە دیارە هیوایە
ئەوەی ڕێگام ڕۆشندەکاتەوە
چرای ئەقڵ، شەمی هەڵکراوی بیروڕایە،
بەقەد ژمارەی قەسابەکان
لەم وڵاتەدا جەللادی ئەقڵ
جەماوەری مێگەل دەبینم،
خەمی من هەنووکە نان نییە
بۆ مەرگی بیرکردنەوەیە شینم،
کە بیرکردنەوە لەم خاکەدا بووە خەیاڵ
ئیدی هەموو نەزانێک زانایە
کە سیاسەت لەم وڵاتەدا ئەقڵی پێویست نەبوو

ئیدی هەموو گێلک دانایە،

پۆستی ژمارە (67)
ڕێکەوتی 27.11.06

هەرچییەک هات دانچەرمووی خۆی لە گەردنی بوونم چەقاند
هەرچییەک هات دڕندانە پەڕەی ناسکی دڵمی دڕاند،
هەر پۆستەچییە هات
باوەشێک خەمی خستە سندوقی پۆستەکەمەوە
هەر جارێک سندوقی پۆستەکەمم کردەوە
دەستەوارەیەک خەم خۆیان خستە باوەشمەوە،
من نموونەی تەنیاترین مرۆڤم
پەڕاگەندەیەکی خەمبار
نووسەرێکی ئیدیاڵیی بێکەسم،

پۆستی ژمارە (68)
ڕێکەوتی 28.11.06

یەکجار
تەنها یەکجار
کاتێک ژیان چیدی پێویستی بە پاڵتۆ نییە
ئەو کاتەی بۆنی گوڵ دێت سەرەتای بەهار،
تەنها جارێک بیرم لێبکەوە
تەنها جارێک یادەوەرییم بخوێنەوە،
بمخوێنەوە، ئەوکاتانەی پێکەوە دادەنیشتین
هاژەیەکبووین لە ئەشق
ئارەزوو لێوەکانی تەڕ دەکردین،
تەنها یەکجار و چیدی نا
بەهێمنیی نەرم و نیان یادمبکەرەوە
ئەو ساتانەی دەمی ساوام
بە گۆی مەمکتەوە دەنا،
تەنها یەکجار چاوەکانت لێبکبنێ ئیدی من لەلاتم

ئیدی من بەشێکم لە ترپەی لێدانی دڵت
بەشێکم لە گەرمیی جەستەت
من خۆم  نۆتەی ئاوازی حەزەکانتم،
ئاوازی تێکەڵبوونێک، کە لە پیانۆکەی نۆڤێچێنتۆوە دێت*
هاواری ئۆرگازمێک، کە لە گەرووی تەنیاترین مرۆڤی ئەم دونیایەوە دێت،
یەکجار چاوەکانت لێکبنێ
هەست بە هەڵاوی هەناسەم دەکەیت
یەکجار بیرم لێبکەرەوە
شەکری لێوت لەسەر لێوی غەمگینم دەنێیت،
یەکجار نامەیەکم بۆ بنووسیت
ئیدی هەتا مەرگ بۆ ئەشق نەبێت
بۆ هیچ شتێکی تر ناگریت،
کە گریاشیت بە دەسڕی ئاوریشمی هەستی من نەبێت
بە هیچ شتێکی دی تاکە فرمێسکێکت چییە نایسڕیت،

* نۆڤێچێنتۆ: پاڵەوانی ڕۆمانی نۆڤێچێنتۆی ئەلێساندرۆ باریکۆ

پۆستی ژمارە (69)
ڕێکەوتی 29.11.06

چاوەڕێم سبەی لەگەڵ یەکەم تیشکدا
پۆستێک وەربگرم نموونەی هەموو پۆستەکان بێت
پۆستەچییەک بۆم بهێنێ تەتەری نێوان هەردوو جیهان بێت،
تەتەرێک پێیەکی لەوێندەرە ئەوی دیش لێرە
تەتەرێکە هاوڕێی هەتاو و دۆستی سێبەرە،
پۆستێکم پێدەدات پڕاوپڕ بێت لە ناڵە
پۆستێک بێت لێوان لێو لە تێڕامان
خاڵیی خاڵییش لە تۆڵە،
من هەرگیز پۆستێک وەرناگرم زادەی ڕۆحی تۆڵە بێت
ئاخر بۆیە لە ماڵی کەللەی مندا بیرکردنەوەیەک چییە شک نابەیت
بە ڕەنگی ڕق نیگار کرابێت،
من نیگاری ئەقڵیک ناکەم بمکاتە ڕێسێنتیمۆیەک
ڕێگا بە هیچ دەستەڵاتێکیش نادەم بمکاتە ئێچە هۆمۆیەک،

پۆستی ژماره (70)
ڕێکەوتی 30.11.06

کوان ئەو دەنگانەی دەیانویست بیرکردنەوەم بشێوێنن؟
ئەو ترسنۆکانەی گەرەکیان بوو باڵەخانەی ئەقڵم
بە تیرۆری هزر بڕمێنن
ئیمڕۆ هیچ چارەکیان بۆ نەماوە بێجگەلەوەی
دەبێت گرێبەندی بێئەقڵییان بە نەشتەری متووربەی کلتوور بدڕێنن،
من ئەو چەکووشەم بازنەی کلتووره داخراوەکان دەشکێنم
ئەو ڕەشەبایەم تەقە لە پەنجەرەی داخراوی پەیڤ هەڵدەستێنم،
دەرگای ئاسنیینی ئەو کلتووره داخراوە دەکەمەوە
کە سەدان ساڵە ژەنگ لە خۆی بەردەدات
ڕەهێڵە دەهێنمە ئەو کلتوورەوە
کە چەندیین سەدەیە چەتر بەسەر باڵای وەرزی متووربەدا هەڵدەدات،
من ئەو کلتووره نامۆیەم، کە پێیدەڵێن دیموکراسیی
چەند سەدەیە دەرگات لە ڕووم داخستووە ئەی خۆرهەڵات
سەمەرە نییە، کە نامناسیی،

پۆستی ژماره (71)
ڕێکەوتی 01.12.2006 پادبورگ (دانیمارک)

لە تارییکیی دەترسێین چونکە ڕەش ناناسین
لە شەو سڵدەکەینەوە چونکە شەوان بە هەڕەشە دەپەیڤیین،
ئەوی ڕەشی ڕەشکردووە ئێمەین
دەنا شەو ئارامتریین چرکەساتەکانی ژیانە
ڕەش ڕەنگێکە بۆ دەرکەوتنی سپیی
ڕەش وەک پێناسێک بۆ خەتا بەشێکی ژیانی هەموومانە،

پۆستی ژماره (72)
ڕێکەوتی 02.12.06

شیین تۆ واتایەکیت بۆ ژیان
دڵفڕێنیت لە نیگادا پەیامێکیت بۆ واتاکان،
ئاسوودەیی دەبەخشیت
دژ بە دڵتەنگیی و ئاستەنگەکان دەجەنگیت،
بەبێ پرتەقاڵیی وەک واتایەکی ونبوو وەهایت
کەچیی لەگەڵ پرتەقاڵییدا ڕەنگێکی یەکپارچە پڕ بەهایت،
ئای لە شیین و پرتەقاڵیی
ئای لە جوانییان لە تابلۆدا
لە ساماڵی ڕۆژێک
لە دار پرتەقاڵێک لە ژێریدا،

پۆستی ژمارە (73)
ڕێکەوتی 03.12.06

چەند ڕۆژە دوورم لە هەموو هەواڵێکەوە
بەستراوم بە گۆشەگیریی و دەرگا و پەنجەرەی ماڵێکەوە،
بیردەکەمەوە دەمەوێت بزانم، کە هەم
سەگی تۆڵە پێمدەوەڕێت
ژیانم هەرگیز خاڵیی نابێت لە خەم،

پۆستی ژمارە (74)
ڕێکەوتی 04.12.06

تۆڵەی من لە ناحەزانم بەرهەمهێنانە
چێکردنی شوێنگەیەکە بۆ ئەقڵ
لێبووردەیی و کێشانی تابلۆی ژیانە،

پۆستی ژمارە (75)
ڕێکەوتی 05.12.06

دوو چاوم هەیە ڕەچەناس
دەزانم چیی لەبەردەمما کەوتووە
بریینێکە شەق بردوو

ئازارێکه کەس نەناس،
هارمۆنیی من جوانه وەکی گوڵ
نەورەسانە سەما دەکات
گشت هەستی جوان دەگرێته دڵ،

پۆستی ژماره (76)
ڕێکەوتی 06.12.06

له سامالّی ئەم نیگایەدا هەموو جوانییەک دەبینم
ئاوێنەیه ئەم دڵه
تۆ تینی گەرمی شەمێک
منیش پەروانەیەکی باڵ نەخشینم،
هەتا گەرمییم بدەیه من هەردێم
ترسم له سووتان نییه
نامەوێت بوونم ببێته زەوییەکی دێم،*
بسووتێ ئەی شەمی ڕێکەوت بسووتێ
من پێویستم بەو گڕەیه
لێگەڕێ با باڵەکانم لەبەرپێتا هەڵوەرێ،
من بەبێ باڵیش توانای فڕینم هەیه
ئەوەی له زەوییدا دەمخات بێ باڵیی نییه
خاڵییبوونه له سووتان
ژیانێکی بێ دڵدارییه،

* دێم: زەوییەکی ڕەق، که کشتووکاڵی تێدانەکرێت.

پۆستی ژماره ( 77)
ڕێکەوتی 07.12.06

هێزم نییه پێهەڵبێنم، لەبەرپێمدا گوڵێک ڕوواوه
تارییکی بینینی سەختکردووم
ناسینەوەم لێشێواوه،
ئاخۆ دەبێت چەند جوان بێت ئەم گوڵه؟
بۆن و بەرامەی مەستی کردووم
ئاشقی بووه ئەم دڵه،

**ئاخ تارییکیی جوانیی هەموو شتەکانمان لێزەوتدەکەیت**
**دزێکی بێ چاو و ڕوویت هەرچیی جوان بێت تۆ دەیبەیت،**
**ئێستا دەزانم هیچ شتێک بەبێ ڕووناکیی جوان نییە**
**هیچ جوانێکیش بەبێ ڕووناکیی بوونی نییە،**

**پۆستی ژمارە** (78)
**ڕێکەوتی** 08.12.06

**مەلێک مەلبوونی خۆی بە فڕین دەسەلمێنێ**
**مرۆڤێکیش بە مرۆڤایەتیی**
**مەلێک، کە نەیتوانی بفڕێ**
**مەلێتیی خۆی لەکیس دەدات**
**مرۆڤێک لێبووردنی نەبوو**
**دڕندەیی لە ملی ژیان دەکات،**

**پۆستی ژمارە** (79)
**ڕێکەوتی** 09.12.06

**هاوڕێیەتیی بارانێک نییە ناوەخت دابکات**
**ئەو گوڵێکە زۆر لەسەرخۆ چرۆ دەکات،**
**من نازانم قەت هاوڕێم هەبووە؟**
**یان هەمبووە و بزرم کردووە،**
**خۆ ئەگەر ونمکردبێتن ئەوا بەسەرچوون و ناگەڕێنەوە**
**وەلێ ئەگەر من ئەوانم لەبیرکردبێت**
**یان لەجێگایەک دامنابێتن**
**ئەوا ڕۆژێک لە ڕۆژان لەسەر ڕێگامدا سەوز دەبنەوە،**

**پۆستی ژمارە** (80)
**ڕێکەوتی** 10.12.06

**سیاسەتمەندارێکی هێند برسییت**

به دەستێک ڕووی سەوزی دۆلار ڕادەمووسیی و
به دەستێکی تریش نانی دەمی خەڵکیی ئەدزییت،
گەراجەکەت لە بری ئاوتۆمبیلێک دوانی تێدایە
چونکە تۆ بە لاندکرۆزەرێک سەبووریت نایە،
ژێرزەمینەکەت بە بەهەشتی ساونا و سویمینپول ڕازاوەیە
ژوورەکانت بە تەکنیکی مۆدێرن
لە ژوورێک بارێک بۆ سەر گەرم کردن
ژوورێکی ترت به خشڵ و مورو
بە تابلۆی چێوە زێڕین ڕازاوەیە،
لە بری هاوڕێیەک سەدانت هەیە
هیچ کاتێک دڵتەنگ و تەنیا نیت
دونیا بۆ تۆ یان بۆ حەزە
یان بۆ سیاسەتی ئاژاوەیە،
دەپێمبڵێ بۆ تێر نابیت؟
درنجێکی سەرمایەدارییت
لەگەڵ سەرمایە و خەتا نەبێت
لەگەڵ هیچی دی ئاشنا نابیت،

پۆستی ژمارە (81)
ڕێکەوتی 11.12.06

هەموو بەیانییەک بەردەمی پەنجەرەکەم لێدەگریت
هەردەم نادەمێک جریوەی پاسارییەک بە قیرەت دەبڕیت،
وەک ئەوەی پۆستەچییەکی نوێم بیت
چاوەڕێ دەکەیت نامەکانت لێوەربگرم
دێمە بەردەمی پەنجەرەکەم دەستێک بۆ تۆ درێژ دەکەم
بەوی دیش تەمی سەرڕووی شووشەکە دەسڕم،
دە بقیرێنە بدوێ لەگەڵم
من لەو قیرانەت بێزار نیم
ئەی قەلەڕەشکەی سەرپەنجەرەیماڵەکەم
ئەوەی هاتە بەرنیگام زامێک بوو دیم،
بریینداریت بەرپەنجەرەکەمت کردووە بە لانە
لەتاو ئازار دەقیرێنیت بەتەنگتەوە نادێن

باڵندەکانی ئەم کۆڵانە،
من ئەم زامەت بە دەزووی ڕۆح بۆ دەدوورمەوە
لە ماڵەکەمدا ڕاتدەگرم
ئەم ئازارەت لەبیر دەبەمەوە،

پۆستی ژمارە (82)
ڕێکەوتی 12.12.06

هەموو بەیانییانێک بە تارییکی
هەموو دوانیوەڕوانێک هەر بە تارییکی
ڕێگایەک دەگرمەبەر
ئەرکێکم لەسەرە، بەڵێنێکە
خۆ ئەگەر لەو ڕێگایەدا مردووشم
دەبێت ئەو بەڵێنە بەرمەسەر،

پۆستی ژمارە (83)
ڕێکەوتی 13.12.06

سوێندە بە نیشتیمان
بە گەورەیی ئەم خاکە
بە ناوی پیرۆزی کوردستان،
بە تەنها لەبەر تۆ هەڵبستم
بۆ هیچ شتێکی تر نا
چونکە بەتەنها تۆیت سروودی من
مارشی نەتەوە و هەڵبەستم،
ئەی ڕەقیبی* ساڵەهای ساڵ
خرۆشی دڵی نەتەوە
تاکە پەناگەی کوردی ڕووت و ڕەجاڵ،

* مەبەست لە سروودی ئەی ڕەقیبی دڵدارە.

پۆستی ژمارە (84)
ڕێکەوتی 14.12.06 کتاژمێر 12:50

ئەم کوردستانە برینێکە
لەوەتەی هەیین ئێمەی برینپێچ
هەتا بێت زیاتر فوارەی خوێنی بەربووی قووڵتر دەکەینەوە،
ئەم کوردستانە دارستانێکی گڕگرتووە
سەدان ساڵە ئێمەی ئاگرکووژێنەوە
نەمانتوانیوە درەختێکی سووتاوی چییە بیکووژێنینەوە،
سەدان ساڵە دوژمنان ئەم خاکە لە خاچ ئەدەن
ئێمەی ڕزگارکەر دێین سەرلەنوێ هەتکی دەکەینەوە،
سەدان ساڵە ئەم خاکە گڕتێبەربووە
لە بنی پێ هەتا تەوقەسەری دەسووتێ
سەدان ساڵە ڕەز و بێستان
شار و گووندی
بە خۆراکی ئاگر دەکرێ،
سەدان ساڵە نەمانتوانی کڵپەی گڕی گووندێک چییە
شارێک چییە دامرکێنینەوە
سەدان ساڵە بە چەکووشی خوێن
دەرگای داخراوی سەردەم ئەکووتینەوە
ساڵانێکی ژەنگگرتوون ناکرێنەوە،
لە "سایکس بیکۆ"وە هەتا بێکەر هاملتۆن
لە بەغدادەوە هەتا واشنتۆن
زنجیری مێژووی کۆیلەیی کورد دەچننەوە،
ئێوەش ئەی سەرانی مۆدێرنی کورد هیچ نین
بێجگە لە هەتکەرانێکی تری نوێی نیشتیمان
هیچ نین بێجگە لە چەند گەورە بازرگانێک
دەیان ساڵە تەرازوویەک وا بەدەستتانەوە
تایەک پڕ لە دۆلار تایەکیش هاوسەنگ بە خاکی کوردستان،

پۆستی ژمارە (85)
ڕێکەوتی 15.12.06 هەینیی

لەسەر لێواری جیهانێکم پڕ ڕەهێڵە
بە "با"وە دەرزیی ژانەکان لە کەللەم دەچەقێن
جیهانێک پڕ جادەی بەریینی تاوان

پۆلیسەکانی خەتا تێیدا دەگەڕێن،
ژیان ئیمڕۆ شانۆیەکە، کەس نازانێ کەی دەستی پێکردووە
هەزارەهای تێدا مردوون
کەچیی هێشتا ئەکتەر قسەکانی خۆی تەواو نەکردووە،
گرنگ نییە چەندی دی دەخایەنێت
گرنگ ئەوەیە کێ ڕۆڵی مرۆڤایەتیی تێدا دەبینێت؟
کەس نییە لەم تارییکییەدا چرایەک هەڵبکات
هەرکەسێک دێت تف لە تارییکیی دەکات
پڕ بە گەرووی جنێو بەم ئەنگووستە چاوە ئەدات،
نازانن تێگەیشتن لێبووردنە
ئەوەی بیر لە تۆڵە دەکاتەوە
ڕۆحێکی شەڕانگێز، مرۆڤێکی ڕمووزنە،

پۆستی ژمارە ( 86)
ڕێکەوتی 16.12.06 شەممە

ترست نەبێت، مەجوڵێرەوە، بێدەنگبە هیچ کەس چاوی لێمان نییە*
ڕابوەستە، دەمەوێت تەماشات بکەم
من هەمیشە ئاوها تەماشام کردوویت
کەچیی تۆ قەت بۆ من ئامادە نەبوویت،
مەترسە هەنووکە من تەواو لێتەوە نزیکم
هەستم پێ ناکەیت؟
من لێرەم، دەتوانم بتجوڵێنم
ئەوە ئاوریشمە، هەستی پێدەکەیت؟
ئاوریشمی کراسەکەی بەرمە
چاوەکانت دابخە، با هەست بە لەشم بکەیت،
هەرئەوەندەی بۆ یەکەمجار جوڵاندمیت، دەبیە خاوەنی لێوەکانم
دەمەوێت بە لێوەکانم بتجوڵێنم
وەلێ تۆ نازانیت لەکوێ،
لەناکاودا هەست بە گەرمیی لێوم دەکەیت
وەلێ نازانیت لەکوێ،
ئەگەر تۆ چاوەکانت نەکەیتەوە
چاوەکانت بە داخراویی بهێڵەوە
لەناکاودا هەست بە دەمم دەکەیت

وەلێ نازانیت لەکوێ،
پێدەچێت لە چاوانتا، لێوەکانم بخەمە سەر پێڵوی چاوەکانت
دەبێت هەستی پێبکەیت، کە چۆن گەرمیی من دێتە مێشکتەوە
کە چۆن لێوەکانم دێتە چاوانتەوە،
یاخوود لەسەر چووکت*
لێوەکانم دەخەمە سەری
ئەوکاتەی بەهێواشی تێیدا قوڵدەبمەوە
لێوەکانم دەکەمەوە،*
ئەم پۆستە دەمەو دوانیوەڕۆیەکی درەنگ
هەستێک خستیە سندوقی دڵمەوە
پۆستێک بە ڕەنگی ڕۆح نووسراوە
لە ئێستاوە هەتا مەرگ
بۆ چرکەیەک چییە لێمجیانابێتەوە،

* نامەی کچێکی یابانیی، کە بە خەتی یابانیی نووسراوە بۆ " هێرڤە جۆنکۆر" و خاتوو بلانچە بۆ هێرڤە جۆنکۆری دەخوێنێتەوە و بۆی وەردەگێڕێتە سەر پەیڤی فەڕەنسیی. وەلێ لە کۆتایی ڕۆمانەکەدا دوای مردنی هێلێنەی ژنی هێرڤە جۆنکۆر، دەردەکەوێت، کە هەر خودی هێلێنە خۆی ئەم نامەیەی بە فەڕەنسیی نووسیوە و بلانچەش وەریگێڕاوەتە سەر پەیڤی یابانیی. ئەم تێکستانە لە ڕۆمانی "ئاوریشم"ی ڕۆمان نووسی ئیتالیی ئەلێساندرۆ باریکۆوە لە لاپەڕەکانی ( 112، 111، 110)وە وەرگیراوە.

Alessandro Baricco: Seide. Von Karin Krieger

*چووک: لەڕاستیی دا بە واتای کێری منداڵ دێت، وەلێ لە هەژاریی پەیڤیی کوردیی دا، مەخابن چ شتێکی ترم بەدەر لە وشەی چووک دەستنەکەوت بتوانم سوودی لێوەربگرم. لێبەڵێ هێشتا من ئاسوودەم بەو وشەیە هەربۆیە لە وەرگێڕاندا بەکارمهێناوە.

پۆستی ژمارە ( 87 )
ڕێکەوتی 17.12.06 یەک شەممە

مرۆڤە گەمژەکانی مۆسیقا پێیانوایە، کە ئەوان تاکە دەنگی ئەم دونیایەن
وەلێ نازانن لەناوەندی ئۆقیانووسەکاندا نۆڤەچێنتۆیەک هەیە،
مرۆڤە زۆردارەکان پێیانوایە، کە ئەوان تاکە دەستەڵاتی ئەم دونیایەن
کەچی نازانن لەودیوو هەورێکی تەڵخەوە خۆرێکی گەش هەیە،
مرۆڤە پارەدارەکان پێیانوایە، کە ئەوان ڕەسەنترین مرۆڤی ئەم دونیایەن،
گێلن نازانن ئەم ژیانە دایکێکە هەزارەها کچ و کوڕی ئەدەبی لە کۆشدایە،

* نۆڤەچێنتۆ: مەبەست لە پاڵەوانی ڕۆمانی نۆڤەچێنتۆی ئەلێساندرۆ باریکۆیە.

پۆستی ژمارە ( 88 )
ڕێکەوتی 18.12.06 دوو شەممە 10:32

گوێم لە هاژەی شەپۆلەکانی دەریایە
لێرە نەورەسەکان ناڵینێک لە دەنگیاندایە،
تاریک و ڕوون هەریەکەیان بە نۆتەیەک
لە شووشەی پەنجەرەی مرۆڤێکی تەنیا دەدەن
باڵدارێکی ڕۆحانیین، بەیانیان بانگی ئازارەکانی خۆیان ئەدەن،

پۆستی ژمارە ( 89 )
ڕێکەوتی 19.12.06 سێ شەممە

من خۆم پۆستەچییم
وەلێ کاری من ئەوەیە لە دەرگای بیرکردنەوەی خەڵکیی بدەم
پۆستێک لە تێرامان بکەم بە سندووقی بە تاڵی خەڵکیی دا
نووسیین لە خەیاڵی بێ واتا و هەژاریی ئەقڵ ڕزگار بکەم،
نووسیین بەرهەمی ئەقڵە نەک خەیاڵ
ئەی خەیاڵپووچەکانی پێنووس
ئێوە هەژارتریین نووسەری ئەم خاکەن
ئاخر بۆیە لە ئیمڕۆ بەدواوە ئێوە دەکەم بە نموونەی نەزانیین
بە درەنگگرێکی ئیدیاڵ،

پۆستی ژمارە ( 90 )
ڕێکەوتی 20.12.2006 چوار شەممە

ئەم زەوییە دێمە* سەرکەشیی قەد تێدا سەوز نابێت
بەپیتە بۆ کۆیلەیی
مرۆڤ تێیدا هەتا کۆتا ژێردەست دەبێت،
نیشتیمانپەروەر خاوەنی ویستێکە بەرەو دەستەڵات
کۆیلە سستە ویستی ئەو ژێردەستییە
ژیانی ڕاوەستاوە لەسەر بەزەیی و پیاهەڵدان و خەڵات،

ئەوەی دەیان ساڵە من لەم سەردارانەدا دەیبینم ملکەچییە
هەستێکی گەورەی خۆبەکەمزان
(ویست)ی کۆیلەبوون و ژێردەستییە،
ئاگایانە کۆیلەن
هیچ نەبوون ویستیانە
خۆیان لا هیچە، لە خۆبەکەمزانیندا بێ وێنەن،
تەماشاکە ئەو فەرشە سوورەی زۆردارانی بەسەردا دەڕوات
شانازیی و شکۆی ئەم کۆیلانەن
ئەو پێڵاوانەی ئەو کۆیلانە بۆیاخی دەکەن
پۆستاڵەکانی پێی ئەم دڕندانەن،
بریینی نێوچەوانی ئەو گەنجە
گوللەی چەکی دەستی ئەم پاسدارەیە،
چاوی کیمیاکووشتووی ئەو کیژە
فەرمانی دڕندەیی ئەم دیکتاتۆرەیە،
سەری بڕاوی ئەو گووندە ئێستا
دەنکی تەزبیحی فاشییەکانی ئەنکەرەیە،

پۆستی ژمارە ( 91 )
ڕێکەوتی 21.12.06 کاتژمێر 13:54

شەوان هەست بە هەناسەیەک دەکەم
گەرمیی لە ڕووخسارم دەدات
هەست بە گەرمییەک دەکەم
دڵم خۆش و گەردن و ملیشم تەڕ دەکات،
بەئاگا نایەم دەزانم تۆیت
دەزانم هەتا بە ماچی ناودەمت
گەرووم پڕ نەکەیت لە نۆتەی ئارەزوو ناڕۆیت،
با لێوەکانت لە جەستەم نەبێتەوە
با دەستت بە هەموو شوێنێکمدا بێت
با هەتا دوا چرکەی ئەم حەزە
چاوەکانت نەکرێتەوە،
بەندی نێو ئاوریشمی لێوەکانتم بکە
جەستەم بە گڕی سینەت
بە تێکەڵبوونێکی بێ کۆتا

ڕۆحیشم بە ئەشقت سڕکە،

پۆستی ژمارە (92)
ڕێکەوتی 22.12.06 کاتژمێر 18:00

بەڕێگاوە پەنجەی نەرمی باژن
قژم شانە دەکات
من ڕێبوارێکی کۆڵانەکانی خەیاڵم
ئەویش گڕتێبەربووانە لەباوەشیم دەکات،
ئاخر ئەشق وەهایە تێکەڵبوون کوا پرسیاری بۆ هەیە؟
باژن، کە شەیدای ماچێکی لێوت بوو
کات و شوێنی کوا بۆ هەیە؟
خۆزیا هەر باژن ئاشقم بوایە
لەکوێدا ویستی پەلاسی نێودەمی ماچکردمایە،
هەرکات شمشێری شێخ و مەلایان خۆیان دەرخستایە
ئەو بە قاقاوە مێزەر و کلاوەکانیانی تەپوتل ببردایە،
باژن قەت تەنی شاراوەی خۆشنەویستووە
تەماشاکە چۆن پاییزان دەرپێ و سووخمەی درەختەکانی
بە تەنافی گڤەیا هەڵخستووە،
بەفری بە زاوایی بۆ هێناون هاواری ئۆرگازمیانی
تێکەڵ بە لوورەی خۆی کردووە،
باژن بێشەرمترین ئاشقی دونیایە
ئەشقێک باژنانە نەبێت
قەت شەمی جوانیی تیا هەڵنایە،

پۆستی ژمارە (93)
ڕێکەوتی 23.12.06 کاتژمێر 11:30

دەشێت پوورەهەنگێک وروژێنرابێت
وەلێ هیچ هەنگێک لەم ڕێیەدا نامگەزێ
دەشێت گەرووی هەموو دونیا بە نۆتەیەک تەقێنرابێت
وەلێ هیچ کەسێک لەم ڕێیەدا لاژە ناچڕێ،
ئەم هەنگانە زستانەن بە گوڵی بەفرەوە نەبێت نانیشێنەوە

هەنگی وڵاتی خۆرئاوابوونن
لە ئێوارەی پیرۆزدا دەفڕن
شەکری جلیوە لە دەمی یەک دەکەنەوە،

پۆستی ژمارە (94)
ڕێکەوتی 24.12.06 کاتژمێر 08:00

سیی و شەش ساڵە وێڵم بەدوای پەپوولەیەکەوە
یەکەمجار هەرهێندەی توانیم دەست لە زەویی تووندبکەم چنگمدایە
منی بێهێزی ساوا توانای هێشتنەوەییم لە چنگمدا نەبوو،
کە پێمگرت یەکەم هەنگاوم بۆی هەڵهێنا نەمگرت
منی ساوای تازە پێگرتوو توانای ڕاکردنم نەبوو،
یەکەم ڕاکردن، کە فێری بووم بەدووی ئەو کەوتم
زامێک پێی سمیم
منی منداڵ پێڵاو لەپێمدا نەبوو،
مێرمنداڵ بووم ڕۆژێک بە خشپە خۆمدا بە باخچەی پڕ ڕیحان و مێخەکی ماڵدا
دڕکێک بە گەورەیی بەژنم
چەقییە سەر دڵم
ئیدی زانیم من تاقانەترین منداڵی ئەم شارەم،
لەو ڕۆژەوە هەتا ئێستا ماڵە و ماڵ دەگەڕێم
شارە و شار، وڵات بە وڵات
بۆن بە هەموو باخچەیەکەوە دەکەم
گوڵێک نەما نەمگەزێ
دڕکێک نەما نەچەقێتە پێم،
منی یەکپارچە خوێناویی، هێشتا وێڵم
بە کزانەوە و سووتانی ڕۆح
بە تەنیاییی شەوی یەڵدا فێرم،
هەنووکە، کە دەمم نەماوە بۆ پێکەنین
وەرە پێکەنین بنووسینەوە
هەنووکە، کە پێم نەماوە بۆ ڕاکردن
وەرە لەیەکدی نزیکبینەوە،
ئەی پەپوولەی هەستی دایک ڕامەکە لێم
پیاوێکی منداڵم
سیی و شەش ساڵە ڕەنگ و بۆنت دزراوە لێم،

ترسم هەیە پەتووەکە لەسەر خۆم لابەرم
خۆت وەرە بەیانیی باشم لێبکە
چیدی لەدەستم ڕامەکە
ببە بە هاوڕێی گوڵی سەرم،

پۆستی ژمارە (95)
ڕێکەوتی 25.12.06 کاتژمێر 17:39

لەگەڵ یەکەم هەنگاوی تاریکییدا هەنگاو دەنێیت
پیرێکی سەرڕێی خەمی نانیت
چاوەکانت کەمبینا
بە ئاستەم ڕێگاکان پێدەزانیت،
پیرێکی چەند جوانیت
شەڕ لەگەڵ تەمەن و باوبۆران دەکەیت
بە شەکەتیی لە ناوەڕاستیی تاریکیی دا
شەمێک بۆ ژیان هەڵدەکەیت،

پۆستی ژمارە (96)
ڕێکەوتی 26.12.06 کاتژمێر 13:15

دەمەوێت بۆنی ڕۆحت بکەم
چیدەبێت ئەگەر بێیت لە جۆلانەی شیعرێکما ڕاتبەژەنم؟
گوڵستانێکی پێگرتووی دەمەوێت لەگەڵتا پێبکەنم،
ئەی جوانی لەناکاو پەیدابوو
فلوتێکی ئەفسووناوییت
دەمەوێت بە لێوی سوێی شیعریێ بتژەنم،
تۆ باخی گوڵی یان بەژنی مۆسیقا؟
پووزی سپیی و نەرمت
ئاگری کڵپەکردووی ڕان و سنگت
بەرگ دادەدڕێنن لەبەرما،
بە دوو هەڵوژە ڕەشکەی چاوانت بانگمدەکەیت
دەم و لێوم بێ پشوو دەمژیت

تۆ شەمێکی هەڵبوویت منیش پەروانەیەکی ئاشقت
نە من گوێ بە سووتانم دەدەم، نە تۆش جارێک سەیرم دەکەیت،

پۆستی ژمارە (97)
ڕێکەوتی 27.12.06 کاتژمێر 06:20

بێ لە من کەسی تر بە ئاگا نییە
خۆم نەبێت کەسی تر چاوی لە سووتانی ڕۆحت نییە،
هێند بەدوای ئەشقا ویڵیت پێیەکت لە باشوورە و
پێیەکیش لە باکوور
بەم گڕەوە شار نەما وڵات نەما نەگەڕێی
بۆ نیگایەکی نزیک بۆ ئەشقێکی دوور،
ئەی ژنی چاوان یەکپارچە نیگا
ئەی ئاشقی لێوان لێو لە مۆسیقا،
هەنووکە ئەوەندە نزیکم لێت
پەنجەرەی چاوانت هەڵمی هەناسەمی لێنیشتووە
خونچەیەکی تازە کراوەیت
سینەت شەونمی ماچەکانی منی گرتووە،
دەست بنێ سەر سینەت هەناسەکەم
ئەو کاتانەی من لە نووکی پەنجەی پێت
هەتا پێڵووی چاوەکانت ماچدەکەم،
ئەی ئاشقە شیرینەکە چاوەکانت بنووقێنە
بە ڕیشی سێ ڕۆژەم دەتبزوێنم
هەست بە تاڵی ئاوریشمی ڕیشم دەکەیت؟
ئەوە منم بمدوێنە،
لێوم لە لێوت دەخشێنم
هەناسەم تێکەڵی هەناسەت دەبێ
ماچت دەکەم دەستەکانم لە سینەت گیردەبێ،
هەنووکە بلورێکی داگیرساوی
قاچم لە قاچت ئاڵاوە
مەلەی گۆمی جەستەت دەکەم
من دەزانم لافاوی هاوارت

هەرگیز وەک ئیمشەو هەڵنەساوە،

پۆستی ژمارە (98)
ڕێکەوتی 28.12.06 کاتژمێر 19:25

ئەی نیشتیمان بەم ئێوارە وەختە سەرقاڵی چیت؟
ئاخۆ تۆش لەگەڵ مندا بۆ مەرگی ساڵێکت دەگرییت؟
دە بگریی بۆ مەرگی هەموو ڕۆژێکت
بگریی بۆ هاواری هەموو ساڵێکت،
ڕۆژگار ڕۆیی
ساڵ تێپەڕیی
کەچیی تۆ هێشتا بەندی،
بەندی دوژمن، بەندی پارە
بەندی کورسیی،
هەتکت دەکەن ڕزگارکەران
دەتفرۆشن داتدەتاشن
نەوەی دەهریی* و دەورەدان*،

* دەهریی: گوێ بەهیچ نەدەر.
* دەورەدان: تەقلادان لەگەڵ بەرەی بەرانبەر لەپێناوی پێکهاتن و گرێبەند بەستن بۆ مەبەست و نیازێ.

پۆستی ژمارە (99)
ڕێکەوتی 29.12.06 کاتژمێر 09:12

تۆ ئەی ماندوو
تۆ ئەی خاک
لەوەتەی هەیت دەسووتێی
کەسێک بە هەق، کەسێک بە دڵ ڕزگارکەرت نەبوو،
دە بنوو ... بنوو ... بنوو
بنوو ئەی خاک

دەنا لە ئاگاییدا بەرگەی ئەم هەموو سوێیە ناگری
بنوو دەنا هەموو تەمەنت دەبێت
بۆ کچێنیت بگریی،
بەختەوەر ئیمڕۆ ئەوەیە ئەم گەندەڵانە ناناسێت
ئاسوودە ئەوەیە هەتا نەمانی ئەمانە
لە خەو هەڵناسێت،

پۆستی ژمارە ( 100)
ڕێکەوتی 30.12.06 کاتژمێر 01:20 دوانیوە شەو

بەم هەموو ژانەوە ئەی ساڵ دەستبەردارمبە
بەم هەموو برینە مۆرانەوە ئەی ژیان لەگەڵمبە،
لەگەڵمبە من نامەوێت ئەم برینانە بمکووژن
ئەوە ڕموزنەکانن حەزیان پێناکەم
وەلێ تۆم خۆشدەوێ وەکوو هەتاو
وەکوو ژن،
ئەم برینانە چرکەیەک چییە لێمناگەڕێن
جارێک نییە نەبنە قیژە
نەبن بە سوێم،
باڕەشێکن هەڵکردوو لە تەوری ڕق
دەیپەڕێنن گەردنی ڕۆح
ملی باریکی گوڵی هەست
دەست و پەنجە و چاو و گوێم،
من نەمدەویست لە برین "بم"
نەمدەویست ئێسک و پروسک
گۆشت و خوێنی تەشەنا بم،
شەوێک، ڕۆژێک
لە ڕۆژ و مانگ و ساڵێکدا
کە کاهینەکانیش نازانن کەیە
بە ناسۆرەوە لە دەمی قڵیشاوی ئەم برینەوە
بەربوومەوە

من گریەیەکی گڕگرتوو بووم
فووی ویژدانێک چییە نەیکووژاندمەوە،
ئاخر برین کوا ویژدانی هەیە؟
تەشەنا کوا وەرزی ساڵ و
شەو و ڕۆژی بۆ هەیە؟
کێ لە گریەی ساوایەک دەپرسێ؟
دڵ، کە تۆزقاڵێک بەزەیی نەبوو
کوا خۆری تێدا هەڵدێ؟
لەو ڕۆژەوە هەتا ئێستا گریەی ساوایەکی نەویستراوم
لەو ڕۆژەوە هەتا ئێستا نۆتەی مێژوویەکی نەبیستراوم،
ساوایەکی گەورەم باوەشێک نییە بمگرێتە خۆی
دەمێکی وشکبۆوەی برسییم گۆی مەمکی دایکێک نییە بیمژم
هەرچییەک هات دامیەبەر شەقی ڕۆژگار
هەرچییەک هات دووری خستمەوە لە ویژدانی نەبووی خۆی،
ئای لەم هەموو ئازارانە
ئای لە کێم و زووخاوی ئەم هەموو ساڵانە،
هەنووکە بڕۆ بڕۆ ئەی ساڵ
ئەی پڕ لە برین و سوێ
ئەی لە ویژدان و سۆزیش بەتاڵ،

پۆستی ژمارە ( 101)
ڕێکەوتی 31.12.06 کاتژمێر 19:50

بڕۆ بڕۆ ئەی ساڵ بڕۆ
بەردە بەرۆکی ژیینم
پڕیت لە دەرد پڕیت لە ژان
چوار دەستەخوشکی چوار وەرزیت
جارێک چییە نەتگرتمە خۆ،
من بێزم لەوانەش دێتەوە لە بەهارێکدا
بۆنی خونچەیەکیان کردبێت
بێزم لەوانەش دێتەوە لە هاوینێکدا
تیشکێکی خۆریان لە گەردن کردبێت،
لە پاییزێکدا لەگەڵ خەزان دا

پیاسەیەکیان لەگەڵدا کردبێت،
لە بەفرانبارێکدا شێرەبەفرینەیەکیان
لێدروست کردبێت،
برۆ ... برۆ ... برۆ
دواچرکەشت لەگەڵما مەبەسەر
قێزم لێت دێتەوە
نامەوێت لە مێژووتدا
ناویشم بگریتە خۆ،
ئەگەر بۆم دەکرا هەرگیز نەمدەهێشت
ناوت هەبێت
ماتماتیکم تێکدەدا
وامدەکرد لە دوای پێنج ژمارەیەک نەبێت
ناوی شەش بێت،
خۆ هێزێک نەبووم ئەفسانەیی وەک خودایەک
ڕۆژ و ساڵم بچەرخانایە
ئەوکاتانەی لە دواهەمین ڕۆژی ساڵدا
هەڵدەستام، بمگووتایە:
تەمەن هاوار بۆ ڕۆژ هەڵنایە؟
سێ سەد و شەست ڕۆژ و پێنج کاتژمێرە دەناڵێنم
کاتی ئەوە هاتووە تووڕ بیت ئەی ساڵ
هێزم نییە چ شتێکی ترت لەسەر بڵێم،
ئێوە ئەی مرۆڤە قێزەونەکان
هەتا دەتوانن گەرووی پڕ بەدی خۆتان بکەنەوە
تووڕە نابم چونکە دەزانم
بەدەر لە جنێو چ شتێکی تری لێ نایەتە دەرەوە،

پۆستی ژمارە (102 )
ڕێکەوتی 01.01.2007 کاتژمێر 16:30

بەخێرهاتیت دوو هەزار و حەوت
من ئەو پەڕاگەندەیەم، کە بە بەرقی چارەنووس
سووتا و نەکەوت،

لەگەڵتا دەژییم
لەگەڵتا پیردەبم
دەشێت لەگەڵتا هەرجارەی ڕەنگێک بگرم،
دەشێت جارێک لێمبدەیت
دەوام نەبێت و بمرم،
کاری من ئەوەیە خۆمت پێبناسێنم
بە ئیشقەوە نەمانی هیوایەکت تێدا بچێنم،
گەرەکمە تێتدا ئاسوودە بم
دوور لە خەم و ناسۆری ژیان
تاڵێک لە پرچی خۆر
نەغمەی سۆزی بولبولێک
لەنجەی فڕینی پەروانەیەکت بم،
بەخێر بێیت ئەی ساڵ
نۆتەیەکی وەنەوشەیییم
وەرە پۆستێکم بۆ خۆت بکە بە ماڵ،

پۆستی ژمارە (103 )
ڕێکەوتی 02.01.2007 کاتژمێر 11:24

هەرچی تنۆکی بارانی ئیمڕۆیە
ماچی خۆشەویستیی منە ئەیدات لە ئەگریجە و پەرچەمت
هەرچی جریوەی ئەم نەورەسانەی دەرکی ماڵە
بانگی خۆشەویستیی منە لە دڵت دەردێنێ ئازار و خەمت،
ئەگەر "با"یەک ڕووتی ڕامووسیی
بزانە هەناسەی من ماچی کردوویت
من ئەم بەیانییە مۆسیقایەکم نۆتەکانی خۆم دیاریی کردوویت،
ملوانکەیەکم لە دەنگی وشە
وام لە ملتا
گۆرانییەکم لە ئاوازی بزە
وام لە گەرووتا،
ئاشقێکی بێکەسم
کەس لە دەور و دڵما نەماوە
تۆیت گشت کەسم،

شاعیرێکی مەلول و داماوم
خۆشم دەوێی بەقەد چاوم،
ژنێکی دڵشەمیت
ڕێی تاریکیی پێ نازانی
ئاشقکێیت خۆت بە لەیلای مەجنون دەزانی،
تۆ ئاوازمیت
تۆ گۆرانییت
ڕۆحێکی بێگەرد
خانمێکی دڵخەرەندیت،
ئەو "با"یەی شەڕ لەگەڵ پرچت دەکات
ئەشقی منە
ئەو بارانەی گۆنات تەڕ دەکات
سوێی بێ سنووری ماچی منە،
پیرۆزە لەدایکبوونت
بەم هەموو ئەشقەوە
یەکپارچە بەهارە چوار وەرزەی بوونت،

پۆستی ژمارە ( 104)
ڕێکەوتی 03.01.2007 کاتژمێر 15:00

وەرە گوڵم
تۆ دڵمیت
تۆ هەناومیت
وەرە ئەی گوڵی جوان
وەرە ئەی سەودای سەرم
تۆ ئەستێرە و مانگ
تۆ ژیانمیت،
وەرە ئەی ئەندێشە و خەیاڵ
چرای سەر ڕێ و
مانگی تابان
تۆ گلێنەی چاوانمیت،
وەرە ئەی خۆشەویست
ئەی هەناسەی پڕ شەونم

ئەی ژنی جوان
ئەی ڕەنگ گەنم،
وەرە ئازییزم وەرە
وەک تۆ جوان
وەک تۆ میهرەبانم نەدیوە
گوڵێکی هەمیشە گەشی
شەونمی سەر ڕووت هێشتا نەسڕیوە،
وەرە خۆشەویستم
وەرە ئەی دەوای دەردم،

پۆستی ژمارە ( 105)
ڕێکەوتی 04.01.2007 کاتژمێر 21:34

وەرن با لەگەڵ "با" دا سەما بکەین
وەرن با لە پێکەنییمان ملوانکەیەک بۆ گەردنی خاک دروستبکەین،
وەرن با نیشتیمانمان خۆش بوێت
ئەم گابەردەی سەرسینەی بشکێنین
تارییکیی وەدەرنێین خۆری گەشمان خۆشبوێت،

پۆستی ژمارە ( 106)
ڕێکەوتی 05.01.2007

لەچی زیزیت ئەی گوڵ؟
بەم بەیانییە چیی ژاکاندووتی
ئارامییەک بۆ نادەیت بە دڵ؟
ئەگەر هۆی ژاکانت لوورەی "با" بێت
ئەوا دیوارێکت بۆ چێدەکەم هەناسەی پیاوێک نەتگرێتەوە
لە کیشوەرێکدا دادەنێم
بەدەر لە پەپوولە هیچ مەخلوقێک نەتدۆزێتەوە،
مەژاکێ باوانم مەژاکێ
لەگەڵ ژاکانی هەر پەڕێکتدا

شابالّی بزەیەکم دەردێ،
لەگەڵ زییزبوونی هەر چرکەیەکتدا
مێخی خەم سینەم دەکووتێ،
بە زییزبوونت عیسایەکی لە خاچدراوم
مەولەوییەکم نابینا
بە ژاکانت لەکیسمداوە گلێنەکانی هەرتک چاوم،

پۆستی ژمارە( 107)
ڕێکەوتی 06.01.2007

بەم شەوی دەیجوورە وەرە لە جۆلانەی خەونەکانما
ڕاتژەنم
من دەزانم دەفی ئەشقت
من دەیژەنم،
حەز لە ڕۆژبوونەوە ناکەم
پەنجەیەکم دەمەوێت لەم شەوەدا
شەمی ئەشقت هەڵکەم،
گێلن ئەوانەی ڕقیان لە شەو دەبێتەوە
تاریکیی لە دڵی خۆیاندایە
دەنا لەوەتەی ڕۆژ هەیە ڕووناکیی خۆی
لە شەودا دەنووسێتەوە،
وەرە ئەی یار لەم شەوەدا بۆنت بکەم
وەرە ئەی ڕۆح لە تاریکیی ئەم سوێیەدا
ملوانکەی هەزار دەنکەی ماچەکانمت لە مل بکەم،
گوێم لە نمەی ئاوازی ناوی تۆیە
لە شەوێکدا گوزەر دەکەم سەراپام تەڕی حەزتە
نەهاتنت لام نامۆیە،

پۆستی ( 108)
ڕێکەوتی 07.01.2007 کاتژمێر 09:32

ڕەگت خوێنە
قەدت خوێنە
پەلکت خوێنە
بەرت خوێنە
تۆ ئێراقیت
بە بێلی جوتیاری خوێن شەنکراویت
لەیەکەم ڕۆژی بوونتەوە بە جۆگەی خوێن ئاوردراویت،
خوێن لە تۆ ببڕێت دەمریت
تۆ ئێراقیت
دەم و لێوی دوای هەڵقوڕانەوەی خوێنیشت
بەدەستەسڕی لە خوێن هەڵکێشراو دەسڕیت،
چ غەدرێکی گەورەیە لەم زەوییە دەکرێ؟
چ تاوانێکە بە قلێشی شەقبردووی ئەم خاکەدا داچۆڕیوە؟
چ سەرسووڕمانێکە خەڵکیی هەموو بیر و هۆشیان
وەک گەڵای پاییز هەڵوەریوە،
تۆ ئێراقیت
خوێن تێتدا باڵادەستە و ئەقڵ نەویی
تۆ ئێراقیت
مێژووت خوێن ڕەشەبای تێدا هەڵکردووە
ڕۆژێک چییە بەبێ کووشتار ناسرەویت،
وڵاتێکیت یەکپارچە لە خوێن
مێژووت بکەوێت، تۆ ئایندەت بە بلۆکی خوێن هەڵئەچنیت،

پۆستی ژمارە (109)
ڕێکەوتی 08.01.2007 کاتژمێر 22:18

تۆ ئەگەر دەتەوێت ئازاد بیت
پێویستە خاوەنی دەنگ
پێ و هەنگاوی تێکۆشان
دۆستی گیانیی ژیین بیت،
تۆ ئەگەر دەتەوێت سەربەست بیت

ئەگەر پێویستی کرد دەبێت بمریت،
ئازادیی ویستت بێت
سەربەستیی هێز و توانا و باوەڕت بێت،
کۆیلە نەبیت ملی ژێردەستیی کەچبکەیت
جنێوەمەدە بە تارییکیی
چاکترە لە تارییکییدا چرایەک هەڵبکەیت،
تێکۆشە بۆ ئازادیی
مردنە دیلیی
هەناسە و ژیان
گوڵی باخی سەمەنە دیموکراتیی،

پۆستی ژمارە (110)
ڕێکەوتی 09.01.2007 کاتژمێر 09.04

لەوەتەی بیرم دێت من ئاشقم
ئاشقی کیژی گەردن بلوور
شەیدای سینەی بۆنخۆش وەک گوڵی سوور،
خۆشمدەوێ ئەی شنەی هەست و هەناوم
من مشتێ گەنمی حەزم
لەبەر کۆتری دڵتا ڕژاوم،
دەستت ناوەتە ژێر چەنەی خەیاڵ
جۆلانێ بە ئەشقم دەکەیت
وەک شنەی شەماڵ،
خۆشمدەوێ
کچی هەر کانیی و ئاوێک بیت
دەمەوێ،
وەرە با لە زنەی چاوەکانتا
قومێ ئەشق بخۆمەوە
وەرە با لە جۆلانەی قۆڵەکانتا بنووم
چیدی بەم سوێیەوە نەتلێمەوە،
وەرە با ئاشقی یەکبین
پەروانە و گوڵی باخی ژیان

نۆته و مۆسیقای یەک هەڵبەست بین،

پۆستی ژماره (111)
ڕێکەوتی 10.01.2007 کاتژمێر 21:34

بۆچیی لەبەر بۆرانی ڕۆژگاردا ڕانەوەستم
هەرچییەک دێت دەمم دەگرێ
کۆت و بەند دەکاتە دەستم،
بۆچیی بۆم نەبێ دەنگ هەڵبڕم
لەوەتەی هەم گریانێکی داکردووم
ئاوریشمی ئارامییەک شکنابەم
فرمێسکەکانمی پێ بسڕم،
من لەبەر ئەم بۆرانەدا ناجوڵێم
تا ئەو ساتەی دەکەوم
گۆرانیی بۆ ئازادیی دەڵێم،
لێگەڕێن ئازاد بدوێم
دەنا هەتا ماوم ئازارێکی بیر خنکاوی
پڕ بە سوێم،
لێگەڕێن وەک من لێتانگەڕاوم
بە بەرگم بە دەنگم بە ڕەنگم مەحەپەسێن
وەک من بە دەنگتان داخراوە گوێم
بە ڕەنگ و بەرگتان نووقاوە چاوم،

پۆستی ژماره (112)
ڕێکەوتی 11.01.2007 کاتژمێر 09:50

دەمەوێت بە گڕی سینەم
ئەم ئازارەت بڕەوێنمەوە
بە شەمی چاوم
تارییکیی ئێشت ڕووناککەمەوە،
تێدەڕوانم تا بیر لە ئازار نەکەیتەوە

دەتنووسێنم بەسنگمەوە
گریانت لەبیر دەبەمەوە،
وەرە گوڵی ئەوییم
سەربخە سەر سینەم
ئەی چرای ژینم،
با ئازار گوڵی ڕووخسارت نەژاکێنێ
ئەوە ئەشقم لێوتی پێ سوور بکە
با ئەم تلانەوەیە پرچت نەئاڵۆزکێنێ
ئەوە پەنجەم قژتی پێ شانەبکە،
با ئێش پێکەنینت لەبیر نەباتەوە
ئەوە لێوم قاقای پێ لێبدە
با ئەم نەخۆشییە نەتخا
ئەوە پێکانم پێی برۆ
ئەوەش دەستم چەپڵەی پێ لێبدە،
با لە پیاسەی ڕۆژێک بێبەش نەبیت
ئەوە مشتم بیکە بە سوخمە
ئەوەش تاڵێ لە پرچی قەترانم
بۆ چاوت بیکە بە سورمە،

پۆستی ژمارە (113)
ڕێکەوتی 12.01.2007 کاتژمێر 09:45

زانست  کردوونیە کاڵا
ژیان یەکپارچە چەوساندنەوەیە
ئەقڵ لە مرۆڤ بووە بە بەڵا،
دیۆنیسۆسێکم* نەفرەتی هێرای* مۆدێرن لێیداوم
بۆ هەرکوێیەک هەڵدێم بێجگە لە غەدر
هیچ شتێکی دی نایەتە بەرچاوم،
هێزێک بۆ نامکاتە گیسکێک وەک دیۆنیسۆس
بە فریشتەکانم بسپێرێ
ژیانم پڕبکەن لە نەغمەی سۆز،
هەتا ئەم هێرایە جێپێمهەڵبگرێ
من هەڵدێم

بۆ هەرکوێ چووم
خەڵکیی فێری چاندنی شەتڵی ترێی میهر دەکەم
لە هەرکوێ بم
گوڵی سەما و گۆرانیی دەچێنم
خەڵکیی فێری ژیان دەکەم
ڕق لە دڵیاندا دەردێنم،
کێ دەڵێ ئەقڵگەریی ڕزگاری کردین؟
کێ دەڵێ زانست بە دڕندەیەکی مۆدێرنی نەکردین؟
ئیدی بۆ مەستی مەی و میوانی مەیخانە نەبین؟
کە ئێمە نەتوانین مرۆڤ بین
ئیدی چۆن دەتوانین کاڵا نەبین؟
بۆ ئەوەی فێربیت وزەی ژیان بپارێزیت
پێویستە دیۆنیسۆس بیت
پێویستە جوتیاری چاندنی مێو بیت،
وزەی ژیان لە ترێدایە
ئەگەر بۆ ئاسوودەیی دەگەڕێی
ڕەگی لە مەی و گۆرانییدایە،
ئەم ژیانە مۆدێرنە تێکەڵ بە ئاسن و تەکنیک و کاڵای کردووین
ئەم دەستەڵاتە جۆش و خرۆشی مرۆڤیی پاکتاوکردووین،
دەبێت هەتا ماوین ئێمەی وێڵگەرد لەگەڵیدا بجەنگێین
ئێمەی دێوانە ئێمەی شێت
دەچینە هەرجێیەک دەبێت جێیبهێڵین
ئێمەی دژ بە ستەمەکانی ئەقڵ
لە هەرکوێ بین بە خرۆشی مەی و سەما
ڕووی تۆز لێنیشتووی ژیان ئاڕایشت دەکەین،

دیۆنیسۆس: یەکێکە لە خواکانی یۆنان. خوای مەستیی و مەی و ئاهەنگ و خۆشییە، خوای سەوزیی و دارستان و درەخت و گوڵە.
هێرا: ژنی "تسۆیس"ی خواوەندە، پاش ئەوەی پێدەزانێت، کە مێردەکەی واتە تسۆیس منداڵێکی لە ژنێک بەناوی سەمەلەوە هەیە و ناوی دیۆنیسۆسە، ئیدی نەفرەتی لێدەکات هەتا تەمەنی لاوێتیشی هەر بەدوایەوە دەبێت.

پۆستی ژمارە (114)
ڕێکەوتی 13.01.2007

هێندە مەمرەجێنە، خۆت دەزانی بە وێنەی گوڵ دەژاکێم
لەگەڵ هاڵهاتنی خۆردا لێم زیزمەبە
پەروانەیەکم لە کووژانەوەی هەموو شەمێک دەتۆرێم،
بۆچیی ئەوەندە ناڕازییت لێم
تووڕەبوونت لە بچووکترین گۆشەی دڵتا
ناکاتەوە جێم،
لەچیی دەرەنجێی چییە هۆکاری ڕەنجانت؟
بەم بەیانییە، کە خێر و شەڕ هێشتا بەش نەکراوە
لەکوێوە هەڵدەقوڵێ چاوگەی گریانت؟
دە بەس برەنجێ
هەموو دەمێ بەیانیان
بۆ دەهێڵیت کۆتری دڵت بە خەمەوە هەڵفڕێ؟
من، کە لێوم هێشتا تەڕی ماچەکانی شەوتە
سینەم هێشتا سوورەوەبووی چنگ و پەنجەتە،
لە زیزبوونت تێناگەم
بە خەمەوە واهەستدەکەم
گوزەرنشینێکی تاراوگەم،

پۆستی ژمارە (115)
ڕێکەوتی 14.01.2007

هەر ڕۆژەی ژەهێرک دەنۆشم
مرۆڤێکی وێڵ و هەڵهاتووم
ئازاری پۆستەکانی ڕۆژانەم هەڵدەکرۆژم،
بەدەر لە هیچ نامەوێت بیر لە هیچ شتێک بکەمەوە
لەم چەپەرەدا دوورم لە گشت شت
ویستم نییە دەرگا لە هیچ کەسێک بکەمەوە،

بیر له هیچ ناکه‌مه‌وه
ئه‌گه‌ر تیری هه‌رچیی شه‌ڕی دونیا هه‌یه
به‌سه‌ر مندا دابکات باکم نییه
ئاوڕ له هیچ ناده‌مه‌وه،

پۆستی ژماره (116)
ڕێکه‌وتی 15.01.2007

هیچ شتێک له ڕانی ژن جوانتر نییه
ئه‌گه‌ر بێتوو ڕانه‌کان جوان بن
هیچ شتێک له لێوی ژن جوانتر نییه
ئه‌گه‌ر بێتوو لێوه‌کان ئاڵوواڵ بن،
به دوو چاوی نووقاوه‌وه ڕێگا ده‌برِم
به‌دەر له لێوی ئاڵی تۆ به لێومه‌وه
هیچ شتێکی تر نابینم،
له که‌لله‌مدا تۆفانی مۆسیقا هه‌ڵستاوه
بوونت له‌م تۆفانه‌دا نۆته‌یه‌که
هێشتا ناوی لێ نه‌نراوه،

پۆستی ژماره (117)
ڕێکه‌وتی 16.01.2007

ئه‌فرۆدیسیا* وه‌ره بمبه بۆ لای ئه‌و
وه‌ره هێزم به‌رێ هێزی ئه‌شق
نه‌ترسانه پێشکه‌شی بکه‌م گوڵێ به ڕۆژ
خه‌ویێکیش به شه‌و،
کاڵای هه‌ست نین ئه‌م هه‌رزانه
گه‌نجێتیی پاڵیان ده‌نێت ببن به پیاو
ئێستا جوانترین شت لایان شه‌هوه‌ته و
نه‌فره‌تیش ده‌که‌ن له بومه‌زی تێکشکاو،
قه‌ده‌غه‌یه ئه‌م خۆشه‌ویستییه نزیکبوونه‌وه‌ت لێی مه‌رگه

"مۆڕمیی"* ئەم ئەشقەیت
ئەوەی لات گرنگ نەبێت خەڵکە،

* مۆڕمیی: کوڕی مستەر ڕایل لە ژنێکی ڕەش پێست، لە ڕۆمانی خاکێک لە شووشەدا، حەز لە "یان"ی ژنی مستەر ڕایلی باوکی دەکات و دەخەوێت لەگەڵیدا، پاش چەند ڕۆژێک خۆیدەداتە بەرڕێژنەی بەردهاویشتنی کرێکارانی هێڵی شەمەندەنەفەر، بەدرێک ئەیدات بە نێوچەوانیدا و دەستبەجێ دەمرێت.
* ئەفرۆدیسیا: خودای خۆشەویستیی یۆنانییە کۆنەکان.

پۆستی ژمارە (118)
ڕێکەوتی 17.01.2007 کاتژمێر 09:37

بێدەنگم وەک فڕینی پەپوولەیەک
بێ جوڵەم وەک هەڵنەدانەوەی لاپەڕەیەک،
ویستم نییە نە دەنگم بێ نە جوڵە
لەم چەپەرەدا
ئەوی هەمبێ هەستێکە بۆ تۆ
خاوێنیی دڵە،
نامەوێت تێکەڵ بە مرۆڤەکان ببم
ترسم هەیە لە دڵشکان
ئێرەگەرن مرۆڤ، لە ئاوی شەڕ هەڵکێشراون
جیهانێکن بێ هەست، بێ هەبوونی ویژدان،
بێدەنگیی خۆم خۆشدەوێ
هێند بێدەنگم هەندێکجار وادەزانم مردووم
هێند بێ جوڵەم، کە پێموایە، کووژراوێکی لەوێدا کەوتووم،

*ئێرەگەر: بەغیل

پۆستی ژمارە (119)
ڕێکەوتی 18.01.2007 کاتژمێر 08:00

تۆی شەرمن چەکمەجەیەکی پڕ نهێنییت
لەوەتەی هەیت بۆ گوێگرێک دەگەڕێیت بۆی بدوێیت
تۆی شەرمەن نامۆیەکی ئەم جیهانەیت،
ئەوەی خۆت بە ڕاستی دەزانیت دەکەیت
لێ لێمانی دەشارییەوە
چونکە دەزانیت باجەکەی بە خوێنی خۆت دەدەیت،
چەند جوانە بزانم نهێنییەکانت چییە
هەتا ناچار نەبیت درۆم لەگەڵدا بکەیت
تۆ، کە خۆت بەبێ تاوان دەزانیت
ئیدی بۆ ژیانت پڕ نهێنییە؟
دەشێت ئەوەی دەیکەیت هێند زیانبەخش نەبێت
بە چارەکی کۆمەڵکووژیی کلتوورێکی قێزەون نەبێت،
کەچیی تۆی شەرمن لەوەتەی هەیت ناچاری درۆیت
نامۆیەکی بەم جیهانە و
مرۆڤێکی پڕ نهێنیی و ئێجگار سەرەڕۆیت،

پۆستی ژمارە (120)
ڕێکەوتی 19.01.2007 کاتژمێر 09:52

لەوەتەی هەیت ڕادەکەیت
ڕاکردن بووە بە بەشێک لە ژیانت
لەوەتەی هەیت دەگرییت
گریان بووە بە ئاوازی مانت،
دە بەس ڕابکە و بەس بگریی
لەو ڕۆژەوە هەتا ئێستا
کەسێک چییە فرمێسکێکی نەسڕیی
ڕاکردن پێکانتی شەکەت کردووە
گریان شاری قاقا و پێکەنیینتی کاولکردووە،
کاتی ئەوە هاتووە نەگریی
ئێستا و لێرەدا یان بمرە یان بژیی،

پۆستی ژمارە (121)
ڕێکەوتی 20.01.2007 کاتژمێر 07:45

دوێنێ شەو بەبێ تۆ تەنیا بووم
وەک پەنجەرەیەکی کراوە ڕوو لە "با" بووم
"با" هەرچیی لاپەڕە و کتێبی سەرمێزەکەم بوو بردی
تەنیا ئەو شەمە نەبێت، کە لەسەر مێزەکەم دەسووتا
نە کووژایەوە، نە تۆزقاڵێک چییە لە جێگای خۆی جوڵا
ئەویش شەمی ئەویینی تۆ بوو تا نەخەوتم جێی نەهێشتم بە تەنیا،

پۆستی ژمارە (122)
ڕێکەوتی 21.01.2007 کاتژمێر 10:43

کەس وەک تۆ منی نەویستووە
کەس وەک تۆ لە شەوی تاری تەمەندا
شەمێکی بۆ تەنیاییم هەڵنەکردووە،
ئەگەر تۆ نەبایت ئاسمانی تەمەنی من
هەرگیز ئەستێرەی لێ پەیدا نەدەبوو
ئەگەر تۆ نەبایت من هەموو ژیانم
شەوێکی تارییک و درێژ دەبوو،
من لە گۆمی مەنگی ئازارەکاندا
مەلەم دەکرد
دەست لەملانێی شەوانی تاراوگە
بە تاقی هەواری تەنیاییەوە
هێلانەم بۆ چۆلەکەی تەرەی شیعر چێدەکرد،

پۆستی ژمارە (123)
ڕێکەوتی22.01.2007 کاتژمێر 19:10

پیاوی دەبەنگ بەس بەتەنها بە دامرکاندنەوەی شەهوەتییەوە ناوەستێ
ئەمە گلەیی ژنێکە پێماندەڵێ،
پیاوی دەبەنگ خۆیشی داناکەنێ
ئەو هەر لەژێر تەنوورەکانمانەوە

پشکۆی سوورەوەبووی کچێنییمان دەگرێ،
دەبێت لەبەردەمییدا دابنیشین
دەبێت بە لەپی لێو سویکانی بۆ بگرین،
قێزەون نییە ئەگەربێتوو هیچ نەڵێ
سویکانی تا قورقوڕاگەم دەبا
کەچیی هێشتا بە قەحبە ناوم دێنێ،
مەگەر بەس پیاوی دەبەنگ بزانێت
چ شتێک لەوەدا خۆشە، بە قەحبە کچێک ناو بەریت
ئەو کچەی، شەوەتەکانت لە بێشەی لێویا ڕادەژەنێت،
من خۆم دەزانم، چییدەکەم
من بۆ کارێک جەستەم لە تای تەرازووی ئەم پیاوە دەبەنگە دەکەم
گۆڕینەوەیەکی بە ئەدەبە
ئەو لەلای خۆی کارێکم پێدەدات
منیش کچێنیی خۆمی دیارییدەکەم،

پۆستی ژمارە (124)
ڕێکەوتی 23.01.2007 کاتژمێر 10:34

ڕۆژێک دادێت هەموو ئەو پرسیارە لە خۆمان بکەین
ئاخۆ بۆچیی سەفەر دەکەین؟
بۆچیی دەبێت ڕۆژێک دابێت جانتاکانمان بپێچینەوە و بڕۆین؟
دەشێت نەتوانین ڕاستیی بدرکێنین
یاخوود نەمانەوێت لە نزیک ئازییزێکمانەوە بمرین،
یان تووڕەبین و خۆمان لە خاک و مێژووشمان ونبکەین
بۆچیی نەڕۆین لە جێگایەکی دیدا چەترێک بۆ خەمەکانمان هەڵبکەین؟
بڕۆین و وابزانین هەر نەبووین
بڕۆین و جێیەک بدۆزینەوە بەیانیان دەمووچاوی ئازارەکانمانی پێبشۆین،
من بۆیە جانتاکەم هەڵدەگرم و دەڕۆم
چونکە تووڕەم لە گشت شت
لە مرۆڤایەتیی، لە ئەشق، لە دایک و باوک
لە خوشک و برا، لە ورد و درشت،

پۆستی ژماره (125)
ڕێکەوتی 24.01.2007 کاتژمێر 08:50

بە لەپی لێو باوەشتکرد بە دڵما
وەرزێک بوویت لە ئەشق
تەزووت دەهێنا بە لەشما،
دڵم قۆخێک بوو لە نێوانی لێوەکانتا
تەواوی جەستەمت تەنی
هەنووکە موڵکی تۆم، تنۆکێ خوێنتم
دێم و دەچم بە دەمارەکانتا،
دوێنێ شەو بە لەپی لێو داگیرتکردم
بێ ئەوەی یەک وشەم لەگەڵ بڵێی
بە ئەشقت سەرسامتکردم،
تەنها بە لێو چیدی نا
تەنها بە ئەشق چیدی نا
بۆ هەتا هەتایە دیلی خۆتت کردم،
ئەمێستاش دیلی تۆم
پیاوێکم شەلاڵ لە ئەشقی تۆ
پەروانەیەکی باڵ سووتاو بۆ تۆی مۆم،
پیاوێکم ژیان لەگەڵتا بەشدەکەم
کەرتێکی بۆ تۆ، کەرتێکیش بۆ خۆم،

پۆستی ژماره (126)
ڕێکەوتی 25.01.2207 کاتژمێر 08:54

کاتێک پیاوانی پارتم دەدی لە جەنگدا پێدەکەنن
ئیدی من بڕیارمدا جارێکی دی قەت تووڕە نەبم
کاتێک بینیم جەنگ ئەم نیشتیمانەی وێرانکرد
ئیدی بڕیارمدا لەو جەنگەدا من دەنگی تەقەی تفەنگێ نەبم،

که منداڵانم دی باڵایان بە باڵای تفەنگەکانی شانیان دەپێون
من ماڵئاواییم لە نیشتیمان کرد
کە پیاوانی دەستەڵاتم بینی قومار لەسەر ژیانی خاک دەکەن
من نەفرەتم لە سیاسەت کرد،
من دەمزانی تاراوگە بۆ من ژنێکە زۆر جوان
بەرگەی جوانیی ناگرم
دەمزانی کەشتییەکە زۆر گەورە
لەهیچ شوێنێکیدا ئۆقرە ناگرم،
سەفەرێکی درێژە بۆم تەواو ناکرێ
ناشتوانم بگەڕێمەوە بۆ نیشتیمان
چونکە قاقام بۆ جەنگ پێلێنادرێ،

پۆستی ژمارە (127)
ڕێکەوتی 26.01.2007 کاتژمێر 23:12

خۆزگەمە دوای مەرگم بمکەنە پەروانە
تا لە ڕێگای ئەشقی گوڵدا ببمە دیوانە،
ئەگەر بۆ چرکەساتێکیش بووە لە باوەشیا تێر بنووم
ئاشقانە بنێشتی پڕ شیلەی نێو دەمی بجووم،

پۆستی ژمارە (128)
ڕێکەوتی 27.01.2007 کاتژمێر 09:12

ئەگەر بەیانییان مەست بم بە جریوەی بولبول
ئەوا بە دەنگی تۆ من دەبمە بولبول
هەتا بە باوەشی حەزت دەگەم شێتانە دەفڕم لەم چڵ بۆ ئەو چڵ،
تا ئەو کاتەی نادیاریت جریوەم غەمبارە
سەراپام خەم دایگرتووە بەم ڕۆژگارە،

پۆستی ژمارە (129)
ڕێکەوتی 28.01.2007 کاتژمێر 12:33

ئازادیی ئێوە لەویڕا دەردەکەوێت دوای ئەم کارەساتە بدرەوشێنەوە
کارەساتێک، کە خۆتان هۆکاری دروستبوونین
هەنووکە ئێوە نەویستراوتان ویستووە، خۆشتان دەبێت بیسڕنەوە،
هەموو دەنگدانێکتان بە پارت، نەویستنی دەستەڵاتی خۆتانە
پارت بە دەنگی ئێوەدا سەردەکەوێت، ئازادییتان لێزەوت دەکات
ئەو ڕەهەندەی ڕەگی ژیانە،
بە چاو نووقاویی ماچ بکەن، بیکەنەوە لە دەنگداندا
کارێک مەکەن هەموو تەمەنتان ملکەچ و ژێردەست بن لە ژیاندا،

پۆستی ژمارە (130)
ڕێکەوتی 29.01.2007 کاتژمێر 11:44

لێرەوە بیرت لێدەکەمەوە، هیچ مەجوڵێ
با پەپوولەی ماچەکانم بەسەر گوڵی لێوتەوە هەڵنەفڕێ،
چ گوڵێک هەیە لە گوڵی لێوی تۆ جوانتر؟
سروشت هێشتا دروستی نەکردووە گوڵێک لە ڕەنگی لێوی تۆ ئاڵتر،
بەدەر لە من بیر لە هیچی تر مەکەرەوە
ئەوە منم دەستەکانم کردووە بە سوخمەی مەمکەکانت
منم باوەشم کردووە بە جێ ژووانت،
هەرهێندەی تێکەڵت بووم سوێکانت تێکەڵ بە ڕۆحم دەبێت
ئیدی هەتا مەرگ باخچەی ڕۆحم دەبێتە نزار و جێت،

پۆستی ژمارە (131)
ڕێکەوتی 30.01.2007 کاتژمێر 23:45

گوێت لە هەناسەمە؟
ئەوە منم دێمە خەونت
دیوانەیەکم بستە زەمینێک نەماوە نەگەڕێم بۆ ئەدرێسی ونت،
لێگەڕێ لە باوەشتا بنووم
لێگەڕێ لێوم لە جەستەی ڕووتت بسووم،
دەمەوێت ئاوێزانت بم

وەک مێشهەنگ شیلەی ئەشقت هەڵمژم
تا ئەو کاتەی بە ئاگا دێیت، ئیدی هەتا مەرگ دەستبەرداری ئەوینت نەبم،

پۆستی ژمارە (132)
ڕێکەوتی 31.01.2007 کاتژمێر 19:37

ساڵ نییە تەپە تەپ لە پەنجەرەی ژوورەکەم نەدەیت
لە نیوەشەودا ڕامنەچڵەکێنی چرایەک لە ژووری تارییکما هەڵنەکەیت،
سەرلەنوێ ئەو پرسیارەم لا دروست نەکەیت
ژیان شیاوی ئەوەیە بۆی بمریت یان بمریت تێیدا؟
ئامانجی ژیان بەختیارییە ئەگەر تۆ نەتبوو چییدەکەیت لەناویدا؟
ژیان پابەندی ئازادییە ئەگەر مرۆڤ نەیبوو پێویستە بمرێت لەپێناویدا،
لەو پێناوەدا تۆ ئارامت لەخۆت بڕی هەتا ئارامیی بە ئێمە ببەخشیت
بە ئارامیی بەرەوڕووی مەرگ چوویت هەتا خوێنی سەر تەوێڵی ئازادیی بسڕییت،

پۆستی ژمارە (133)
ڕێکەوتی 01.02.2007 کاتژمێر 12:10

کەس وەک من خۆشی نەویستووی
پشکۆی سوورەوەبووی خەمەکانتی
بە پێڵوی چاو بۆ هەڵنەگرتووی،
هیچ کەس وەک من تۆی نەویستووە
بۆ ئازاری خەمەکانت
لە چاوانیا جۆلانەی هەڵنەخستووە،
ئەو کاتانەی، کە تەنیایت
ڕۆحم بێشە و لانەیە بۆت
ئەو کاتانەی خەمباریت
هەناوم دەسووتێت بۆت،
کێ وەک من تۆی خۆشویستووە؟
هەمیشە ئاوێزانی خۆت و خەمت بووم
وەک گوڵ چۆن پەپوولەی لە باوەشی خۆی گرتووە،
دە بەسیە چیدی مەم ڕەنجێنە

تۆزقاڵە زەڕڕەیەکە ئەو دڵەم
بەس نابەدڵ بمدوێنە،
من هێندە تۆم خۆشدەوێ
ناوتم لە ڕۆحما هەڵکۆڵیوە
پەڕاگەندەیەکی ئازار چەشتووم
بەدەر لە ئەشق نیمە چ شتێکی دی بتدەمێ،

پۆستی ژمارە (134)
ڕێکەوتی 02.02.2007 کاتژمێر 09:00

ئەم ئازارە (تەپڵ)ی سەرم لێدەدات
نەخۆشێکی کەنفتم
چاوەڕێی (با)یەکی فێنکم  گڕی ڕووخسارم لاببات،
دوێنێ لەو دیووی پەنجەرەی ژوورەکەمەوە
تەماشای گەمەی درەخت و (با)م دەکرد
چەند دەنگم هەڵبڕی کەسیان نیگای منی ئەمدیوو پەنجەرەکەیان نەکرد،
من لە درەخت و (با) زیبزم
لەو کاتەوەی ڕوویان نەداومێ بە وێنەی گەڵایەکی وەریووی پاییزم،
هەتا ئاشتم نەکەنەوە سەری من هەر دێشێت
پەنجەرەکەشم داخراوە، کەسێ نییە هەواڵی منیان بۆ بەرێت،

پۆستی ژمارە (135)
ڕێکەوتی 03.02.2007 کاتژمێر 09:45

ئەوە ئەو "با"یەیە، کە لە دەربەندی دڵە ڕەشەکانەوە هەڵدەکات
پەپوولە و گوڵ لەیەکتریی پەرتەوازە دەکات،
ئەوە ئەو دەنگە تیژەیە وەکوو ساو دێت
گفتووگۆکان کەرت کەرت دەکات،
تازە چیدی ملوانکەی پساوی دەنگەکان کۆناکرێتەوە
وشەی زیبز هەرگیز بەنێو دەزوویەکی پساودا ناچێتەوە،
لە دوورەوە
لە ماڵێکدا لەوسەری جیهانەوە،

وەک وشەیەکی زییز و حەپەساو
دەڕوانمە پەرتەوازەییی ملوانکەیەکی پساو،
دەنکێکی ئەو ملوانکەیە شەلاڵی خوێنە
بە ئازاردا تێدەپەڕێت ڕەوەندێکی زامدار و گێژە
لە دوورەوە ڕووناکمدەکاتەوە هەتا تێبگەم
نیگای ئەو نیگای تیشکی ڕۆژە،

پۆستی ژمارە (136)
ڕێکەوتی 04.02.2007 کاتژمێر 13:22

گابەردی هەرچیی شاخی تووڕەبوونە بەریدەیتە گۆمی مەنگی دەستەلاتەوە ناشڵەقێت
ئەم دەستەلاتە پڕە لە پیاوی پووت، پەنجەی کەسیان پێنووس ناگرێت،
ئەم حکومەتە بۆ جەردە و دز دیوەخانە
تفەنگ بەرهەم دێنن
جەللاد بەرهەم دێنن
ئەم پەرلەمانە هەواری نەخوێندەوارانە،
ئەم حکومەتە، حکومەتی پیاوانە
پیاوی جەللاد، پیاوی نەزان، پیاوی ژنکووژ
حکومەت، حکومەتی نیشتیمان هەتککەرانە،

پۆستی ژمارە (137)
ڕێکەوتی 05.02.2007 کاتژمێر 11:16

کچەکەم بەشێکە لە سروشت، مریشک نییە بۆ سەربڕیین
کچەکەم مرۆڤێکی ئازادە، کچێک نییە بۆ خەم و گریین،
کچەکەم کاڵای هەست نییە، پانتاییەکە لە ئەشق
جیهانێکە پڕ پێکەنیین،
داوێن داوێنی خۆیەتی، هەست هەستی خۆیەتی
ئەم شەهوەت لەسەر سینەی برژێت یان ئەو، تێکەڵبوون ویستی خۆیەتی،
کچەکەم باڵای بەقەد باڵای کوردستانە
کچەکەم شانازییمە، کچەکەم ژیانە،
کچەکەم ناکەمە قوربانی کۆمەڵ

کچەکەم گڵێنەی چاوانە،
جیهان هەمووی لەلایەک ئەویش لەلایەک
بۆی نییە لە گوڵ کاڵتری پێ بڵێت
هەستی تووڕەی هیچ برایەک،

پۆستی ژمارە ( 138)
ڕێکەوتی 06.02.2007 کاتژمێر 11:28

یاخیبوون پێویستە بۆ چاککردنی ناتەواوییەکان
ئەو مرۆڤەی ئازاد نەبێت یاخیی نابێت
ژیان لای ئەو بەهەشتێکە بۆ کۆیلەکان،
ئازادیی دیلێک نییە ڕزگاری بکەیت
کراسێک نییە لەبەری ئەمی دابکەنیت لەبەری یەکێکی تری بکەیت،
مرۆڤ بە ویست یان ئازادە یان کۆیلەیە
یان چاوشۆڕی چەقۆ و دراوە، یان نامۆیەکی کەم وێنەیە،
یاخیبە لە ناتەواوییەکان تا ئازادیی وەک خۆی بمێنێتەوە
تەوری دەستی شۆڕشێک مەبە، کە دواڕۆژ درەختی ئازادییت پێدەبڕێتەوە،
لێگەڕێ سەردەم، سەردەم بێت وەک خۆی
مێژوو قەت نەیتوانیوە ئایندە ڕزگار بکات
کات خڕ دەڕوات نەک ڕێک و ڕاست، زۆردارێک دەمرێت، سبەی یەکێکی تر دێتە جێگای،

پۆستی ژمارە (139)
ڕێکەوتی 07.02.2007 کاتژمێر 10:53

کەمن ئەوانەی لە نیشتیمانی مندا مۆسیقارن
ئاوی ڕۆح ئەدەن، ئەوانە وەک دەوای پەرستارن،
زۆرن ئەوانەی هەلەکە سەمای دەهۆڵ کووتان دەکەن
بۆڕەی مانگا لە دەنگی ئەوان مۆسیقییترە
ئەوانە گوێچکەمان پڕ لە نۆتەی شکاو دەکەن،

وڕ و كاسم بە تەقە تەقی ئەم لاژانە
كوا دەرویش عەبدوڵلایەک ڕزگارم بكات لە دەست ئەم ڕیتمە پێكەوە نەگوونجاوانە،

پۆستی ژمارە (140)
ڕێكەوتی 08.02.2007 كاتژمێر 09:34

من، كە یەكەمیین دڵداری خۆم دۆڕاند ئیدی شێتیی بە من نامۆیە
تۆ، كە خۆشەویستی دووهەممیت ئاشقت نیم، لێ دڵ و هەستم هی تۆیە،
توانام نییە بە هەمان دێوانەیییەوە ئاشقت بم
هێزم نییە بەو سۆزەی جارانەوە دواتبكەوم هۆگرت بم،

پۆستی ژمارە (141)
ڕێكەوتی 09.02.2007 كاتژمێر 20:35

لە ئێراقدا گەمژەیی ئاسانترین كارە
ئەوی هەستی بۆ مرۆڤ نەبێت دڕندەیەكی زۆردارە،
هیچ شتێک لەوە ئاسانتر نییە لە ئێراقدا وەک گێلبوون
هیچ جەژنێكیش پیرۆز نییە بەقەد جەژنی تیرۆر و خوێن بەربوون،
ئەمە ئێراقە وڵاتی خوێن ڕشتن و دڵڕەقییە
ئەوەی هەستی مرۆڤایەتیی بێت بە تۆزقاڵەزەڕڕەش تێیدا نییە،

پۆستی ژمارە (142)
ڕێكەوتی 10.02.2007 كاتژمێر 14:00

كامەیە ڕاستیی بچووک و سادە؟
وڵاتێكم هەیە لە بنی پێ هەتا تەوقە سەری كارەساتە،
ئەوە كامە ڕێكەوتە وام لێدەكات شتێكی نەبوو بپارێزم
لەم شەڕەدا، كە لەگەڵ شەیتانەكاندا دەیكەم، تاكێكی پڕ ورە و هێزم،
كامەیە موعجیزەی ئەم وڵاتە، هەتا ڕاستییە سادەكانمان نیشان بدات؟
گەمژەیە ئەو مرۆڤەی دەیان ساڵە لەم خاكەدا چاو لە ڕاستیی دادەخات،

پۆستی ژماره (143)
ڕێکەوتی 11.02.2007 کاتژمێر 17:11

لە ئێراقدا دەسته‌ڵات و تیرۆریست یەک مافیان هەیە، ئەویش کووشتنه
دەسته‌ڵات و تیرۆریست جەللادن مافی کووشتن بە خۆیان دەدەن
کاری ئەوان تۆڵە سەندنەوەیە، باجی خوێنەکەی بە خەڵکیی دەدەن،
ڕۆژێک چاوم نەکردەوە لەم خاکەدا مرۆڤ نەکووژرێت
لێرە شەوێک سەرم نەنایە سەر سەریین، لەوێندەر پەتوو لەسەر مرۆیەکی خەوتوو
لانەبرێت،
هەنووکە قوربانییناانیش بەڵگەنامەی کووشتنیان پێدراوە
دەسته‌ڵات و تیرۆریست و قوربانیی هەرسێکیان مافی کووشتنیان هەیە
هەرسێکیان تۆڵە دەکەنەوە،
تینوویەکی دڕندەن، خوێنی یەکدیی دەخۆنەوە،

پۆستی ژماره (144)
ڕێکەوتی 12.02.2007 کاتژمێر 20:34

بەبێ خوێن کۆتایی بەم کارەساتە بهێنە
با لێبووردن چرای ڕێگات بێت
لەسەر ڕێگا گوڵی ڕاستیی برووێنە،
ڕاستیی بە خوێن نادۆزرێتەوە
تۆ، کە نامۆی ڕێگای ڕاستییت
غەریبێکیت وەک نالیی بە گریان مێژووی تاراوگە دەنووسیتەوە،
خوێن ناڕاستترین شایەتە لەسەر ڕاستیی
تۆ چەند پاک بیت ئەو ژەهراوییت دەکات
دەتکاتە بوونیەتێک لە کینە و ڕق
لە قوربانییەوە دەبیتە بکەر
سبەی ئەگەر ڕەشت دی لێت دەبێتە  سپیی
شەو بە ڕۆژ
تیرۆرت لا دەبێت بە نامەی ئاشتیی،

بەبێ خوێن بەم قەیرانەدا تێپەڕە
با خۆشەویستیی هیوای ژیینت بێت
تۆ لێرەوە گوڵی لێبووردن
بۆ دونیای پڕ دڕکوداڵی تۆڵەسەندنەوە بەرە،

پۆستی ژمارە (145)
ڕێکەوتی 13.02.2007 کاتژمێر 10:23

ئەی منداڵی نەجیب تۆ ئازیزییت تا ئەو کاتەی
تەپڵی سەرت مەنجەڵێک پاقلە ڕادەگرێت،
ئەی هەرزەی سالار تۆ خۆشەویستیت تا ئەو کاتەی
دەست و پەنجەت بێڵ و خاکەناز دەگرێت،
ئەی لاوی بە ڕەوشت هەموو تۆیان دەوێت تا ئەو کاتەی
ڕەنجی دەست و بازووت لە دەغیلەی ژیانی ماڵ دەکرێت،
خۆشەویستیت لای خوشک، ئازییزیت لای برا
تۆ خواوەندی خێزانیت، دایک و باوک
کراسی ماچ دەکەن بە بەرتا،
خۆشەویستیت تا ئەو کاتەی بە زەوییدا ڕۆدەچیت
ئازییزیت تا ئەو کاتەی دەبیتە مێرووڵە و باڵ دەگریت،
سالاریت تا ئەو کاتەی دەبیتە نەخۆشێکی کەنفت
پیسایی لە دەرلنگی پانتۆڵەکەت دەکەیت
دەبییە دەعبا  بە چواردەوری خۆتدا تف هەڵدەدەیت،
دەگۆڕێی دەبییە بوونیەتێکی دی
بوونیەتێک چاوەڕێی دەستی هانا دەکات
منداڵێکی نەجیبی دوێنێ و ئاشووی* ئیمڕۆ
کەس قوومێک ئاو بۆ لێوی وشکی نابات،

* ئاشوو: کێم، کە لە برینێک دێتە دەرەوە

پۆستی ژمارە ( 146)
ڕێکەوتی 14.02.2007 کاتژمێر 11:35

ماچێکت دیاریی دەکەم ئاڵتر لەو گوڵەی دەستت
ئامێزێکت پێدەدەم گەرمتر لە هەناسەت
ڕووناکتر لە چرای هەستت،
وەرە ئاوێزانت بم
میوانی ساتەوەختی مەمانت بم،
وەرە با هەنگی ماچم
لە گوڵی لێوت بەردەم
وەک منداڵێکی لاسار باوەشی گەرمت قەت بەرنەدەم،
ئاشقتم، ئاشقی چاوی باز و
گۆنای وەک سێو
دەمەوێ سەری گۆی مەمکت بگرم بە لێو،
چیتدەوێ لێم لەم فالنتینەدا
ئەوە منم بۆت دەسووتێم
لە ئاگری شەڕ و کینەدا،
سووتانێک، کە هیچ لێی پەشیمان نیم
مەگەر منیش پەروانەیەک نەبم
ئاشقی ئەو شەمە بووبێتم، کە شەوێک لە شەوان دیم،

پۆستی ژمارە ( 147)
ڕێکەوتی 15.02.2007 کاتژمێر 17:24

نیگات دەکەم
نیگام دەکەیت
تۆ سەرسامیت بە جوانیی من
لەمنیش وایە، کە تۆ پەرییت،
دەست بە پێستما دەهێنیی وەک ئەوەی پێشتر لەو ڕەنگەت نەدی بێ
منیش گیرۆدەی لێوتم، پێموانییە شەکراوی سوێیەکی وەک منت
بە لێو گرتبێ،
نیگام بکە، نیگات دەکەم
پێیەک بنێ سەر ئەم ئاگرە
ڕۆحی خۆمت قوربان دەکەم،
دەست بە سوێیەکمدا بهێنە
ملوانکەی ماچێکت لە گەردن دەکەم،

ئەم نیگایە هەردووکمان لەناودەبات
لە دوای تێکەڵبوونت من هیچ شتێک لە مردن بە جوانتر نازانم
تۆش "با"ی چارەنووس هەڵتدەگرێ و بۆ کیشوەرێکی ترت دەبات،

* بۆ "مۆرمیی" و "یان" نووسراوە لە ڕۆمانی خاکێک لە شووشە دا.

پۆستی ژمارە (148)
ڕێکەوتی 16.02.2007 کاتژمێر 09:12

یەکپارچە شەکراوی ئەشق بوویت
یەکپارچە نۆتەی مۆسیقا
تۆی شەم قیبلەگای منی پەروانە بوویت،
چیی هەبوو لە تۆ جوانتر؟
وەک تۆ پڕ میهر و لە تۆش ماچ تەڕتر؟
بیرم نایەت بیرم کردبێتەوە، کە چیم دۆڕاندووە
لێ هەنکووکە پێدەزانم، کە چیم نەبردۆتەوە،
من نەمدۆڕاندی لێ قەدەر وایکرد، کە تۆ بڕۆیت
لەوێندەر بەیانیان ڕووخسارت بە لەهجەیەکی تر بشۆیت،
قەدەر وایکرد، کە من بڕۆم
لەوێندەر نەمامێک ئاو بدەم
لێ من خۆم لەبەرەکەی نەخۆم،
خۆشەویستیی تۆم خستە تای تەرازووی زۆر ژنەوە
کەسیان وەک تۆ گرانبەها نەبوون
کەسیان وەک تۆ پارچەیەک لە خۆر و
دڵ ڕەنگکراوی بەفری ساڵ نەبوون،
تۆ سادە بوویت وەک خاک، بۆیە کەس نرختی پێنەدەزانی
گوڵکی نەدۆزراوە بوویت، کەس ناوتی نەدەزانی،
شۆخ بوویت وەک چنار
گوڵێکی گەش بوویت، وەک یەکێک لە گوڵەکانی بەهار،
ئەگەر شتێک هەبێت پێیبڵێن ئەشق: ئەوە تۆیت
ئەگەر خاوەنی یادگارێک بم، یادێکی جوان
ئەوە تۆیت لەم وێنەیەدا، کەوا ئێستاش
بەری درەختی نیگای چاوم دەخۆیت،

پۆستی ژماره (149)
ڕێکەوتی 17.02.2007 کاتژمێر 19:35

حەز دەکەیت دەست بە سوێیەکتا بهێنم، کە تازە چرۆی کردووە
حەز دەکەیت بۆنی گوڵی بەهارت بکەم، کە تازە ڕەنگی گرتووە،
لەگەڵ لافاوی ئەو مۆسیقایەی گوێی لێدەگریت
لەگەڵ شەپۆلی ئەو سوێیەدا، کە بە لێو دەیگریت،
خەیاڵ دەکەیتەوە و دەڵێی: هیچ شتێک لە دەستی پیاو جوانتر نییە
ئەگەر بێتوو دەستەکان جوان بن
هیچ میلۆدیییەکیش لە دەنگی سوێ جوانتر نییە
ئەو کاتانەی لە گەرووی ژنێکەوە دەردەچن،
لەناو ئەم عەشامە کوێرەدا دەست بەم سوێیەمدا بهێنە ئەی پیاو
پەنجەت یەک کەم قەوس بکەرەوە
هاکا زانیت ئەم سوێیەم بوو بە یەکپارچە شەتاو،

* شەتاو: ئەو ئاوە زۆرەی، کە لە بەفری تواوەوە سەرچاوە دەگرێت.

پۆستی ژمارە ( 150)
ڕێکەوتی 18.02.2007 کاتژمێر 11:14

دەگەڕێیت بۆ دۆزینەوەی شتی دی
دەگەڕێیت بەدوای ڕاستییەکی وندا
دەتەوێت باوەڕ بە شتێک بکەیت، کە خۆت دەیبینی،
هەستێک دەتبزوێنێت
هەستێک لەگەڵ گەمەیەکی ئاڵۆشاوییدا دەتدوێنێت،
لێ تەمەنی تۆ هێشتا تەمەنی ئەو گەمەیە نییە
کۆمەڵی تۆ بەڵێیەکیان بۆ ئەو وازییە پێ نییە،
چییدەکەیت هەتا کۆمەڵ ئەم هەستانەت بە نەفرەتەوە تەماشا نەکات؟
لەکاتێکدا ئەفرۆدیسیا چرکە لە دوای چرکە بۆ هەواری ئەو هەستەت دەبات،
دەتەوێت بڵێی، کە منیش هەم

تۆش ئەشقێک پیادە دەکەیت، کەمتر نییە لە ئەشقەکەی کاکە مەم،
کۆمەڵ قەت نەیتوانیوە ئەم ئەشقە تابوو بکات
ئاخر بۆیە لە نهێنییدا درەختی ئەم ئەشقە قەدەغەیە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ باڵا دەکات،

* ئەفرۆدیسیا: یان ئەفرۆدیتە، خودای خۆشەویستیی و جوانیی یۆنانییە کۆنەکان.

پۆستی ژمارە (151)
ڕێکەوتی 19.02.2007 کاتژمێر 08:21

ئەشق لەکوێی، بۆ تەنیا جارێک خۆت نیشان نادەیت؟
کەنفتم بەبێ تۆ، بەرلە هەڵهاتنی خۆر
بۆ سەردانم بۆ نایەیت؟
تەمەنێکە بێ تۆ دەژییم
منی نیوەکەی تری تۆ، نامۆیەکی گرینۆکم
ئەوکاتانەی تۆ دووری لێم، من بۆت دەگرییم،
ئەشق هەردەبێت بتدینمەوە
لەهەرکوێ بم، لەهەر کوێ بیت بۆت دەگەڕێم
ملوانکەی بچڕاوی هەزار دەنکەی ونبووت ئەهۆنمەوە،
چەند ستەمە منێک هەموو تەمەنم تەرخانکردبێت بۆ بۆنکردنی گوڵەکان
شەوانم تەرخانکردبێت بۆ دیتنی مانگ و ئەستێرەکان
ڕۆژانەم دانابێت بۆئازاری چقڵی خونچەکان
کەچیی هەنووکە بێ گوڵم
ئاسەواری جەنگی گوڵ ئەشقە
بۆیە ئەمێستا چۆڵەماڵی دڵم،
هەتا ئێستاش گوێم لە قاقای گوڵەکانە
ئەوکاتانەی لەکاتی بۆنکردنیاندا سەری پەنجەیان دەگەستم
گوێم لە پێکەنینی مانگە ئەو کاتانەی لە پشتی هەورەکانەوە
چاوشارکێی لەگەڵ دەکردم،
ئەستێرەکان هەندێکجار وەها لێم نزیکدەبوونەوە هێندەی نەدەما دەستیان لێبدەم
هەرکە دەستم بۆ دەبردن هەڵدەهاتن، پێدەکەنین
نەیاندەهێشت سەری پەنجەی خوێناوییمیان نیشانبدەم،
لەوڕۆژەوە زیزم لە گوڵ و مانگ و ئەستێرە
هەتا ئەشق ئاشتمنەکاتەوە نایاندوێنم

ئەگەر ئەوانیش ڕاستدەکەن، با خۆیان بێنەسەردانم
با ئەوان بێن بۆ ئێرە،

پۆستی ژمارە (152)
ڕێکەوتی 20.02.2007 کاتژمێر 19:23

ساڵێک نەبوو ئەم ڕۆژەم ڕەنگبگرێت
ساڵێک نەبوو تەمەن لەم ڕۆژەدا
لە باوەشی سۆزیم بگرێت،
هەموو ساڵێک لەم ڕۆژەدا سندوقی پۆستەکەم
پڕە لە ڕۆژنامەی فرۆشتنی کاڵا
پڕە لە نامەی ناوەخن پڕ بەڵا،
نامەی سۆزێک چییە بۆم نایەت
هەوری بۆر ڕووخساری ئاسمانی داپۆشیوە
چاوم بە ڕوویدا هەڵنایەت،
ساڵێک نەبووە لەم ڕۆژەدا
کانیاوی چاوم نەتەقێ
لە خەمی تەمەندا نەچەقێنم
باوەشێک نەبێت لە خۆیم بگرێ،
باوەشێک بۆنی ئێسک و خوێنمی لێ بێت
دەستی هانایەک لە نیشتیمانەوە نێردرابێت،
لە مێژە تەمەنم بۆنی ئێسک و خوێن و خاکی لێنایەت
لە قولاییی شەودا بۆ چرایەک دەگەڕێم
چیبکەم خۆری بەختەوەریی من هەڵنایەت،

پۆستی ژمارە (153)
ڕێکەوتی 21.02.2007 کاتژمێر 13:19

ئەم بەیانییە دەریایەک بوویت لە قولاییتا مەلەم دەکرد
شەماڵێک بوویت لەگەڵتا پیاسەم دەکرد،
ئەم بەیانییە بەهارێک بوویت، هەرچیی گوڵی وەرزی خۆتە دات بە من

منیش هەرچیی هەستم هەبوو کردمە ملوانکە و کردمە ملی تۆ ژن،
با بچین پیاسەیەک لەژێر نمەی باراندا بکەین
ببین بە تنۆکێک باران
ڕۆحمان دیاریی جۆگە و ڕووبار بکەین،
با باران پیاماندا داچۆڕێ جەستەمان لە خەم بشواتەوە
پاک بین وەک بارینی ئەو
لەناو ئەودا بتوێینەوە،

پۆستی ژمارە (154)
ڕێکەوتی 22.02.2007 کاتژمێر 18:00

لەپشت تەڵخیی ئەو هەورانەوە دەرکەوە
تا بت بینم
لەگەڵ بروسکەی هەورێکدا وەرە خوارێ
تا بتدوێنم،
خەنجەری ئێشێکت لە تەوقی سەرم چەقاندووە
لە بنی پێمەوە هاتۆتەدەر
چەند ڕۆژ و شەوە پێوەی دەناڵێم
لە جەستەی خۆمدا کردوومیە دەربەدەر،
لەوەتەی هەم بەدەر لە ئازار چ شتێکی دیت لێم نەویستووە
لەوەتەی هەیت بێجگە لە نانەوەی کینە و شەڕ
ئازار و خوێن هیچی ترم لێت نەبیستووە،
تۆی دڕندەی پشت هەورەکان
تۆی نێنەرەوەی گشت شەڕەکان،
هێند بە ئازاردان ئاسوودەیت بە خۆشیی مرۆڤەکان نا
هێند سەرقاڵیت بە تلاندنەوەی مرۆڤەوە
بە ڕزگارکردنیانەوە نا،
تۆیەک، کە لە کارەساتی هەڵەبجەدا لەوێ نەبوویت
لە دادگای تاوانبارانیدا بۆ لەوێ بیت؟
تۆیەک، کە لە ئەنفالدا دیار نەبوویت
لە پشتگیریی تاوانبارانید بۆ هەبیت؟
لەگەڵ هەموو شتێکدایت لەگەڵ هەق نەبێت
لە پێش وتەی هەموو وتارێکدایت

لە هەقی ژێردەستاندا نەبێت،
ئەگەر سەریشم لەم ئازارەدا بچەقێنێت هێشتا دوا وتەم دژی تۆیە
تا دەبیە هێزێکی میهرەبان، دوا هاوارم بانگی مەرگی تۆیە،
پۆستی ژمارە (155)
ڕێکەوتی 23.02.2007 کاتژمێر 18:43

فەنتازیای من ئەو شتەیە، کە خەڵکیی ناتوانن
بیهێننە بەرچاوی خۆیان
ئەو جیهانەی من دەیبینم بۆ ئەوان نادیارە
خولانەوەیە بە دەوری بازنەدا ژیانیان،
ویستمە من بگەمە سەر ترۆپکی ئازادیی
بە ئاگردا تێپەڕم بۆن بکەم گوڵی ڕزگاریی،
ناپاکن ئەو سەردارانەی ئازادیی بە ئەندێشە و خەیاڵ دەزانن
ئەوانە هەر نۆکەری دوژمنن
کێچی دوژمن بە گەورە و خۆیان بە قارچک دەزانن،

پۆستی ژمارە ( 156)
ڕێکەوتی 24.02.2007 کاتژمێر 16:30

دەڕۆم بە سنگەخشکە
بە چەماوەییی
لەسەر نووکی پەنجە،
نووشتاوەی ئەم ئازارەم
بەم تەمەنەوە وەکی منداڵ خەریکی دارەدارەم،
دەستێکم بە نێوچەوانمەوە
ئەوی تریشم بە کەمەرمەوە گرتووە،
درەختێکی شەکەتم هەتا تەوقەسەر
گەڵای ئازارم گرتووە،
دەمەوێت بگەمە باڵکۆنەکەم
لە پشتی ئەو هەورە تەڵخانەوە بۆی بگەڕێم
ئەو دزەی چەندیین ڕۆژە بە دڵما دادەچۆڕێ

هەڵیتەکاندووە پێخەف و جێم،

پۆستی ژمارە (157)
ڕێکەوتی 25.02.2007 کاتژمێر 20:11

دەیان ساڵ لە زیندانێکی مۆدێرندا
دەیان ساڵ وەک پەپوولەیەکی وشککراوە
لەنێوانی چوار دیواردا،
تەنیایی هێند ناسکی کردووم
بە شنەی شەماڵێکیش دەشکێم
من خۆم مەلەوانم
کەچیی لە مەترێک ئاوی ئازاردا دەخنکێم،
هەموو گیانم بۆتە گوێ
واهەستدەکەم هەموو قسەیەک دژی منە
هەموو گیانم بۆتە چاو
پێموایە تەماشای هەموو یەکێک گاڵتەپێکردنی منە،
هەموو گیانم بۆتە هەست
وائەزانم بێ هەستیی ئەم دونیایە
تەنها لەبەر بوونی منە،
هەنووکە نامۆیەکی شەکەت و نەخۆشم
کەسێک نایەت بە لامەوە
"با"ی هەرچیی ئازاریش هەیە ڕووی لە پەنجەرەی کراوەی
نێوان مەرگ و ژیانی منە،

پۆستی ژمارە (158)
ڕێکەوتی 26.02.2007 کاتژمێر 08:06

ئەم خەمە چارەنووسی منە، چییبکەم تێمناگات هیچ کەس
بە ئازاردا تێپەڕییم، کلووی بەفری ساڵ بووم
ئەم کۆمەڵە کردمیە قەقنەس،
من قیژەی ئەو دارچنارە سووتاوەم، کە دەستێک نەبوو بیکووژێنێتەوە
ئازاری ئەو ماسییە باڵدارەم، کە کەسێک نەبوو گەرووی لە قولاپ بکاتەوە،

منی ئازار بەو قولاپەوە بە زیندویێتیی جەستەم دەخۆن
ماسیی گەورە ماسیی بچووک دوای تێربوونیان، دەمیان بە خوێنی من دەشۆن،
وەک ئەوەی خوێنی من دەمیان لە هەموو غەدرێک پاکبکاتەوە
وەک ئەوەی خوێنی من جێگاپێی تاوانەکانیان بسڕێتەوە،
ئیدی چلۆن پێبکەنم، کە من دەمێک شک نەبەم بۆ خەنین؟
چلۆن ماچی گوڵێ بکەم، کە لێوم پێوە نەمابێت بۆ قەڵەمی لێو سڕیین؟
ئەم خەمە چارەنووسی منە، من لە سەرەتاوە لە دەستی شەودا هەڵدەپەڕییم
باوەڕ لێیکردبووم بە خۆرهەتاو
لەم خەمەدا لەدایکبووم، من لە سەرەتاوە ئەهریمەن بە گوێیدا چرپانم
ڕەشی لێکردم بە سپیی، ڕق لای ئەو خۆشەویستیی بوو
ئاگری جەهەننەمیش بەفر و شەتاو،
ئەی تەمەن چ پۆستێکت بۆ ناردووم ئەم بەیانییە
ڕووخسارم هێشتا تەمی خەوی پێوەیە
بیرکردنەوەم تروسکەیەک ڕووناکیی چییە تێیدا نییە،

پۆستی ژمارە (159)
ڕێکەوتی 27.02.2007 کاتژمێر 19:11

بۆ "دۆنارت" ئەو پیرەی منداڵیی لە ئێخەی نابێتەوە.

لە نیگاتا بەدی دەکرێت تابلۆی تەمەنێکی مەینەتکێش
لە وتەتا دێتە گوێم نۆتەی ژیانێکی پڕ دەرد و ئێش،
نەوەی جەنگ بوویت، ئێستاش دوکەڵ لە بەژنت هەڵدەستێ
مەسیحێکی سووتاو بوویت، کەسێ نەبوو لەو ئاگرەدا دەرتبێنێ،
باوکت بۆمبای جەنگ کووشتی
دایکت تێر لە باوەشی نەگرتی
مەرگی دایکت تیغێک بوو چارەنووسی تۆ و خوشکەکەتی پێکەوە بڕی،
ئێوەی ساوا لە ماڵی نەنکێکی دڵڕەقدا لەتکران
لە ماڵی نەنکێکی دزێودا بۆ هەتاهەتایە لەیەکدی کران،
تۆی ساوا نەمامێ بوویت لە دوکەڵی بۆمبادا گەورە دەبوویت
کەسێک نەبوو پێی بڵێی دایە
تۆی بێکەس سکاڵات نەدەیشتە گوێی هیچ خودایە،
لە ماڵی نەنکێکی دڕندەدا باڵات دەکرد
درەختێکی هاوینە بوویت بەرت بۆ ماڵێکی ڕاسیست دەگرت،

هەنووکە پیرێکی شەکەتی، کەچیی هێشتا لە منداڵیی خۆتدا دەژیی
درەختێکی بێداڵدەی هەتا ئێستاش فرمێسکی سەر کوڵمی منداڵیی خۆت دەسڕیی،

پۆستی ژمارە (160)
ڕێکەوتی 28.02.2007 کاتژمێر 13.21

چۆن نەگۆڕێم
چۆن جیهانێک لە دابڕان نەبێتە ڕێگا و جێم؟
لەدایکبوونم بەدەر لە نەفرەتێکی قێزەون چیی دی نەبوو
ئەشقی ژن و ئەشقی دایک بەدەر لە گاڵتەجاڕییەک چ شتێکی دی نەبوو،
ئاخر ژنی ئاشق چلۆن دەبێتە قەسابی هەست
دایک کوو بۆ سەربڕینی ژیانی نەوەی خۆی کێرد و چەقۆ دەگرێتە دەست؟
پێکەنینم دێ بەو ژنەی پێمبڵێ من ئاشقتم
دەرگا لە هیچ پیرەژنێک ناکەمەوە بێت و پێم بڵێ من دایکتم،
هەنووکە من هیچ جیاوازیی نێوان بەردەکانی سەر ڕێ و ژن ناکەم
ئاخر بۆیە لە هیچکامیاندا من هەستی دایکێتییەک بەدی ناکەم،

پۆستی ژمارە (161)
ڕێکەوتی 01.03.2007 کاتژمێر 22:34

دەبێت سەدان کیلۆمەتر تێپەڕێنم تا دەگەمە شارێک پڕ لە کینە
لەوێ بەپێ بڕۆم لەبەر ڕەهێڵە و تۆفی بارانا
ئازارێکم ڕێگا دەبڕم سەراپای گیانم یەکپارچە برینە،
برینێکم هەرچییەک دێت دەمکوولێنێتەوە
ڕۆمانێکم پڕ لە ئێش و ژان
خوێنەرێک شک نابەم بمخوێنێتەوە،
ئای لەم ڕێگا دوورەی لەبەردەممدایە
لە ئاست مندا هەموو کوێرن
کەس چاوی بە ژانی مندا هەڵنایە،

پۆستی ژمارە (162)
ڕێکەوتی 02.03.2007 کاتژمێر 12:24

من تەڕ تەڕ و ڕووناک وەک هەتاو
لە تەوقی سەرمەوە هەتا نووکی پێم هەڵکێشراو
لە ئاو
ئەو وشک و کەشخە، بەڵام تارییک وەکی شەو،
من هەژار ئەو دەڵەمەند
پارێزەرێک لە تەک منەوە، پارێزەرێکیش هی ئەو
لە نێوەندماندا دادوەرێک نیگای هەردووکمانی دەکرد بە تیلەی چاو،
هەردووک گۆشت و خوێنی یەکبووین
ئەو ئاگری دەکردەوە، من سەراپام ببوو بە زووخاو،

پۆستی ژمارە (163)
ڕێکەوتی 03.03.2007 کاتژمێر 19:47

لەبەر نمەی بارانێکدا چاوەڕێمدەکردی ئەی هاوڕێ
تارییکیی ڕێگای پێدەگرتم
سەرما ڕووخسارم
"با" دەستەکانی توند دەگرتم،
تەمەنێکە نەمدیوی
دەزانم ئێستا کۆترێکی تەرە و ماندوو
گەڵایەکی زەرد و وەریووی،
دەزانم تۆش وەک من هاوڕێی زەردەپەڕ و پاییزیت
ئاوازێکی نۆتە کووژراو لە وڵاتی خۆتا غەریبیت،

پۆستی ژمارە (164)
ڕێکەوتی 04.03.2007 کاتژمێر 16:20

بە برسێتیی شەڕ باشتر دەکەین
دەبین بە بوونیەتێک لە ڕق، کراسی خوێن بە بەری یەکتردا دەکەین،
کە چاومان برسیی بوو، فلسی ژەنگهەڵگرتووی سەر ڕێگاش دەبینین
کە سکمان برسیی بوو، جەستە و ڕۆحیشمان دەفرۆشین
بەرانبەر بە بوونمان عانەی قەڵبیش وەردەگرین،
بە برسێتیی دونیا بە ڕەش دەبینین
تفەنگێکی میلڕاکێشراوین، چێژ لە تەقاندنی خۆمان دەبینین،
سەرۆکەکانیش لە برساندا شەڕ دەکەن

دەبنە کێڵگەی بۆمبا و خوێن، گیرفانیان پڕ لە نانی وڵاتان دەکەن،
چاویان برسییە، سکیان برسییە، گەڵیان برسییە
گەروویەکی بەربووی خوێنن
بەدەر لە شەڕ هیچ ڕێگایەکی دی پێنازانن،

پۆستی ژمارە (165)
ڕێکەوتی 05.03.2007 کاتژمێر 08:05

گوێم لە نەغمەی قومریی و بولبولە
بۆنی "با"ی بەهار دەکەم
هیوام ئیمڕۆ فڕیینی باڵندەی لەم چڵ بۆ ئەو چڵە،
خۆزیا تەمەن هەمووی بەهار دەبوو
دوور لە وەرزی تەزیین و هەڵوەریین
سەراپای خاک پڕ گوڵ و گوڵزار دەبوو،
ساڵێک نەبوو ڕۆح و جەستەم بە شەختەی ساڵ هەڵنەوەرێ
جارێک نەبوو لە تەزیینی وەرزی ساڵدا
پێکانم لە ڕۆیشتن نەکەوێ،
سەرم بەستوو، پەنجەم وەریوو
زمانم لە گۆ نەکەوێ،
دەبا تەمەن هەمووی بەهار بێ
بەهارساڵێک پڕ لە خۆشیی
ڕێی ماڵەوەم بۆنی گوڵ و خۆرەتاو بێ،
با جریوەت بێ ئەی بولبول
با چاوم لە شنەی جولانی باڵت بێ
هاوڕێمانبە، هاوڕێی من و دارستان و گوڵ
بخوێنە بۆ وەرزی بەهار، پری بکە لە نۆتە، ماڵی چۆڵ و هۆڵی دڵ،

پۆستی ژمارە (166)
ڕێکەوتی 06.03.2007 کاتژمێر 09:42

دەمانێک ساڵ بەرلەئێستا
خاک مۆسیقارێکی جاوید بوو
ئاوازی ئازادیی لێئەدا،

چەندیین ساڵ پێش ئێستا
خاک پێشمەرگەیەکی زامدار بوو
تەپڵی سەرکەوتنی لێئەدا،
درەخت خوێنی لێدەچۆڕیی
بەرد خوێنی لێئەتکا
ئازار وەک گووڵاڵەسووره
لە خاکەوە سەری هەڵدەبڕی،
ساڵانێک پێش ئێستا
شایی و شیینمان لەگەڵ یەک بوو
ئازارمان یەک ڕەنگ
ویستی هەمووان ئازادیی بوو،
چەندیین ساڵ دوای ئەم ڕۆژە
خاک وێران، نیشتیمان پڕ لە دز
بۆ کووتێ نان کۆمەڵگاکەم کار و پیشەیان
پاڕانەوە و نوێژە،

پۆستی ژمارە ( 167)
ڕێکەوتی 07.03.2007 کاتژمێر 15:34

لێناگەڕێی هەر ڕۆژەی بە جۆرێ دڵم دەشکێنی
خۆشەویستێکی سەرشێتیت
هەرجارەی بە ئازارێک دەمگریەنی،
دەمگریەنی تا ئەو کاتەی دەبمە هەڵم
هاوار ژنێکی چەند ماندووی
ئەو کاتانەی دڕکی تووڕەییت دەچێقێنیتە سەر دڵم،
خۆشتبوێم ئەی ژن
تەمەن کورتە بۆ خۆشەویستیی
دیلم مەکە ئەی ژن
ئەوە منی پیاو بووم فێری ئازادییم کردی،
بمبەخشە من ئاشنای پەڕتووک و نووسیینم
بۆیە ڕەنگی لاپەڕەکانیام گرتووە
زمانێکم پێوەیە گوڵی هەق نەبێت چیدی تری نەگرتووە،
تۆ بۆ ڕۆیشتنە دەرەوەیە پەڕتووک و هەقت سووتاند
شەو هەتا بەیانیی چیم نووسییبوو

هەموویت لە ڕەشەبای ڕقێکدا دڕاند،

پۆستی ژمارە (168)
ڕێکەوتی 08.03.2007 کاتژمێر 20:09

با ئەم خەناوکەیەت لە ملدابێ
با ئەم خشڵەت دیاریی من بێ،
ئەی ئاشقە سەر شێتەکە
با لەم ڕۆژی ژنانەدا ڕۆحی منت قوربان بێ،
هەندێکجار هێند شیرینت هەنگی ماچت تێبەردەدەم
هەندێکجار هێند خەمباریت بەسەری پەنجەی پەپوولەش
جورئەت ناکەم لە دەرگای ماچێکت بدەم،

پۆستی ژمارە (169)
ڕێکەوتی 09.03.2007 کاتژمێر 09:56

لەمێژە لەبەردەمی ئەم شانۆیەدا  ڕاوەستاوم
هەناسەی زیندان، خەمێکی قوڵ، تووڕەیی و گۆڕێکی بە کۆمەڵ
لەنێوەندا بۆنی ئایین و  هەور،  کەنیسە و بۆنی دوکەڵ،
من نامۆم، من شەستەی باران و ترسم
کڵاوە زەنگوڵدارەکەم  بە هەوادا هەڵدەدەم بۆ سەما و
خۆیشم بەدوایدا بازدەدەم،* ( لاپەڕە 47)
مۆسیقایەکی جاوید لەکاتی خۆیدا پێشکەشکراو
وەک سێوێکی زێڕیین وەهایە
لەناو جامێکی زیوودا دانراو،
نەمبووە من مۆسیقایەک لەو شێوەیە
هەرچییەک هەڵدەستێ لەلای ئێمە
ئەدەب و هونەر، مۆسیقا و ئاواز
لەبۆی پیشەیە،
گوێم زڕاوە بە نۆتەی دەنگەدەنگکەر
لە مۆسیقایەک دەگەڕێم یەکپارچە شەکراوی نۆتە بێت

دوور بێت له ته‌قه تەق، دوور بێت له دەردی سەر،

لاپەڕە 47. بۆ ڕیشارد ڤاگنەر. Friedrich Nietzsche: Gedichte.

پۆستی ژمارە (170)
ڕێکەوتی 10.03.2007 کاتژمێر 09:23

ئەم "با"یەی لێرەوە هەڵدەکات تەزێنەرە
ئەم هەوارەی تێیدا دەژییم جیهانێکی سەرسووڕهێنەرە،
لەملا خۆر دەستی لە ملمدایە
لەولا سەهۆڵبەندانی ساڵ لە گیانمدایە،
لەملا پێکەنین سکێچی ڕووخسارم دەکێشێ
لەولا گریان لە باوەشی خۆیم ئەنێ،
کوا بەهارێ گوڵی ژیینم تێیدا چرۆ بگرێ؟
کوا کێڵگەیەک شک دەبەم هیواکانمی تێدا بڕوێ،
تەنا* نەبووم ڕۆژێک لە ژیینا
تەلیلەی* ڕۆژگار کووشتمی
ڕژدێکی* دژوار وا لەسەر ڕێما،

* تەنا: ئاسوودە
* تەلیلە: گووتنی لا الا الا اللە بە کۆمەڵ
* ڕژد: هەورازی کوور

پۆستی ژمارە (171)
ڕێکەوتی 11.03.2007 کاتژمێر 10:45

بەکرۆکن* ئەم پاسەوانانەی دەستەڵات
بە خوێندا تێدەپەڕن تا ئەو کاتەی دەگەنە لات،
بەرژەوەندیی ڕەنگ و ڕووی کۆمەڵی گۆڕیوە
ئەو پۆستە خوێنی شەهیدە

ئەو تەلارانە قووتی دەمی خەڵکیی
ئەم نیشتیمانە بێ باوکە لە مێژە ئەشکی سەر ڕووخساری نەسڕیوە،
ئەوەی بەهای نەبێت ئیمڕۆ تۆی ئەی هاووڵاتیی
ئەی بێبەش لە ژیان ئەی مرۆڤی برسیی،
ڕاکە ئەی گەنج ئەم خاکە قولانجی ژیانی بۆ تۆ تێدانییە
سەگ هاوکاری گوورگە
شوان ئاگای لە لاشەی لە پشتەوە خوراوی کاوڕ نییە،

* بەکرۆک: دووزمانیی

پۆستی ژمارە (172)
ڕێکەوتی 12.03.2007 کاتژمێر 08:35

پۆستێک بۆ نۆڤەچێنتۆ

دەرگاوانیی بەهەشت پرسیاری ناوتی کرد
بە نۆڤەچێنتۆ* وەڵامتدایەوە
دەرگاوان دەیان ناوی لە لیستەکەیدا دەرهێنا
هیچیان وەک ناوی تۆ دەنگیان نەدایەوە،
ئاخر تۆ کوڕی دەریا بوویت
لەوێ ژیایت
لەوێ مردیت،
لەگەڵ کەشتی ڤیرگینیاندا* کەرت کەرتبوویت
ئێسک و خوێن و نۆتە بوویت
لەگەڵ ناڵە و دوکەڵی دینامیتا تێکەڵبوویت،
دەرگاوان لێتدەڕوانێ
دەیەوێت هەواڵی تەندروستیت بزانێ،
لە هیچت کەم نییە تەنها قۆڵی چەپ نەبێ
لە بەهەشتدا دوو قۆڵ هەیە زیادە و دانراو
هەردووک هی ڕاستن،ڕەش و سپیین
دوو قۆڵی فڕێدراو،
ئاخ مەسیح بەختت لێرەش نەیهانی

به دوو دەستی ڕاستەوە بۆ هەتا هەتایە لە بەهەشتدا
لێ کامیانت دەوێ ڕەش یاخوود سپیی؟
دوو دەستی دوو ڕەنگ جوان نییە لەگەڵ ڕێزتا بۆ ڕەشپێستەکان
چاکترە هەردووک سپییبن، کاتێک بەکاریان دەهێنیت لەسەر دوگمەکان،
به دوو دەستی ڕاستەوە دەبێت لە بەهەشتدا چیی بژەنیت
ئەگەر بێتوو پیانۆیەکت بدەنێ؟
جیهان لەلای تۆ هەشتا و هەشت دوگمەی ڕەش و سپییە
ئاخر بۆیە خاک لەلات هیچ واتای نییە،

* نۆڤەچێنتۆ: ڕۆمانی نۆڤەچێنتۆ 1900: نووسیینی ئەلێساندرۆ باریکۆ.
* ڤیرگینیان: ناوی ئەو کەشتییەیە، کە نۆڤەچێنتۆی تێدا دەژیا.

پۆستی ژمارە (173)
ڕێکەوتی 13.03.2007 کاتژمێر 08:19

بەبیرم دێ، کە منداڵبووم لە خەونمدا دەفڕییم
ترسی بەربوونەوەم هەبوو لەتاواندا دادەچڵەکییم
هەنووکە گەورەم ترسم نییە بەرببمەوە
ترسم هەیە لەوەی، کە بژییم،
سەختە ژیان لەم چەرخەدا، کاتێک دەڕۆیتە دەرەوە
گیاندار و بێ گیان پێتپێدەکەنن
دەوەنێک خەم لەسەرت دەڕوێت
درەختەکانی سەر ڕێ دەفی سەرت دەژەنن،
ئاگرێکم بە ڕێگادا دەڕۆم بەبێئەوەی کەسێک بمکووژێنێتەوە
ئازارێکی فڕێدراوم کەسێک نییە هەڵمبگرێتەوە،
مەلێکی بەرزەفڕ بووم
هەنووکە فڕیینیان لەبیربردوومەتەوە،
کەنار بە کەنار شەقام بە شەقام دەگەڕێم
لە دەرگای هەموو کەسێک دەدەم
کەسێک نییە دەرگا لە منی بێ باڵ بکاتەوە،

پۆستی ژماره (174)
ڕێکەوتی 14.03.2007 کاتژمێر 12:30

لەوەتەی ئێوە خاوەنمانن
بووینەتە خاوەنی مێژوویەکی درۆزن
شەومان لێدەکەنە خۆرهەتاو
ئەهریمەن بە ئاهوورا
ئاگرمان لێدەکەن بە ئاو،
لەوەتەی ئێوە خاوەنمانن
لە بەستەڵەکدا شەوباش لەیەک دەکەین
بەیانیانیش دەمووچاومان بە ئاگری دۆزەخ دەشۆین،
ئەم خاکە بەرگدروویەکی دەوێ
کراسی دڕاوی هۆشی بدووریێتەوە
ئەم نیشتیمانە باوکێکی دەوێ
دڵی شکاوی ئاشتبکاتەوە،
لەوەتەی هەین خاک هەتدەکەین و نیشتیمان دەتۆرێنین
لەوەتەی هەین گەنج دەکووژین و ئایندە دەڕەنجێنین،
گەنج دەشکێنین و پەرستگاکان زاخاوی خوێنی شەهید دەکەین
گەنج بریینداردەکەین و سەگەکانی دەستەڵاتیان تێبەردەدەین،
گەنج برسیی دەکەین و داوای ملکەچییان لێدەکەین،
بیرمێنە ئەی گەنج هەرچیی پەرستگاکانی دەستەڵاتە
ئەوانە دەغیلەن بۆ ورگی برسیی سیاسییەکان
بیرەوەرییەکی تاڵ نین تەماشای قوربانییەکانیان تێدا بکەین
مۆزەخانەن بۆ بۆنەکانی تاوانکاران،

پۆستی ژماره (175)
ڕێکەوتی 15.03.2007 کاتژمێر 08:30

من پیاوم! کێی تر پیاوە؟
کێ دەتوانێ بڵێ
تەتەری کار بە ئازادیی لەژێر خۆری خودادا ئالێرەدا
هەڵبەزێ و گۆرانیی بڵێ!* 230
من پیاوم بە واتای وشە
بە تەنیا بەرەوڕووی دەبمەوە
کچی قەیسەر ڕاودەکەم
ئاوها بە دڵڕەقیی ئەدرەوشێمەوە، * 230
من پیاوم، ئێوە دەتوانن پیاوەتییم بۆنبکەن، پیاوەتییم وا لە پیشەمدایە
پیشەم دەگرمێنێ وەک گەردەلول
دەنا دەبوو بە چۆکدادان بڕۆیشتمایە، *231
ئەم پۆستە فریدریش شیلەر بۆی ناردووم
لە کۆتایی سەدەی هەژدەوە بەڕێگاوەیە
هەتا گەیشتووەتە دەستی من
سەفەرێکی درێژی لە ڕێگادابووە
هەتا ببێ بە هاوڕێی ئازادیی من،
کێ هەیە ئیمڕۆ لە پیاوەتیی نەکەوتبێ؟
کێ هەیە ئیمڕۆ سەری بڵندی خۆی
بۆ عانەی بەر کۆشکی زۆردار نەویی نەکردبێ؟
نەبووبێتە پەشتەماڵی بەرداوێنی ژنەکانیان
ملکەچ ڕانەوەستابێت
نەیان سڕیی بێت بە پیاوەتیی ئەو
داوێن و گەڵیان،
من پیاوم، لێ ئێوە نا
ئەو کاتانەی من چووبوومە ژێر باڵی ئازادییەوە
ئێوە فیشەکتان پێوە دەنا،
من پیاوم ئێوەش ناپیاو
ئەو کاتانەی بەدوای خۆردا دەگەڕام بۆ شەوی تار
ئێوە ئاگرتان لە خەڵکیی دەکرد بە ئاو،
من پیاوم خاوەن قسەی خۆم، خاوەنی هۆش و دڵ
یەک ڕێگام هەیە ئەویش ئازادییە
ئەوەی ئێوەش باوەڕتان پێیەتی ملکەچییە،
ئێوەی کۆیلەی هۆش بەتاڵ

نۆکەرن، نۆکەر ئاغا و ئاغا ژن و نۆکەری منداڵ،
من پیاوم بوێریی قسەم دەیسەلمێنێ
خاوەنی هێزێکی گووتنم
کۆشکی زۆرداران دەڕمێنێ،
ئێوەش ئەی کاڵفامە کۆیلەکان
لەوەتەی هەن لە شیعر و شانامەتان
ئاودەستخانە دروستدەکەن بۆ نەوەی سوڵتان،

* Friedrich Von Schiller: Gedichte und Balladen. Kastraten und Männer. 230,231

پۆستی ژمارە (176)
ڕێکەوتی 16.03.2007 کاتژمێر 08:05

هەڵەبجە شارانی* تۆ هەموو ساڵێ چاو و گوێچکەی خۆتە لە ملی دەکەیت
ترنگی* ڕاوەستانی تۆ ئێسک و پرووسکی خۆتە چەندیین ساڵە دارە دارەی پێدەکەیت،
چەندیین ساڵە تەماشای برینت دەکەم، هەروەک جاران تازەیە
تەماشای بەرهەیوانی ماڵ و کۆڵان و شەقامت دەکەم هەروەک جاران بێ نووزەیە،
لەوڕۆژەوە تۆ زامداری کەس دەوایەکی بۆ دەردت نەهێناوە
پێنج هەزار دڵۆپە فرمێسکیت لەوڕۆژەوە هەتا ئێستا تنۆکێکت چییە نەسڕاوە،
بەدەر لە مۆنۆمێنتێک وەک دەغیلەی سواڵ و ساقە
بەدەر لە چەند بازرگانێکی سیاسیی دەم تەقیووی وەک فاقە،
خاوەنی هیچ شتێکی تر نیت
لەوڕۆژەوە هەتا ئێستا جار لە دوای جار شکێنراویت
لەوڕۆژەوە هەتا ئێستا برینت سووردەچێتەوە
تۆی هەڵەبجە زەردەشتێکی لە خاچ دراویت،

* شاران: گەردانەی لە گوێز و بادەم دروستکراو.
* ترنگ: پایە.

پۆستی ژمارە (177)
ڕێکەوتی 17.03.2007 کاتژمێر 13:39

"با"یەکی توووند گڤەی دێت
هەرچیی باڵندەی ئەم ناوەیە لەگەڵ خۆیدا دەیبات
لێ ناتوانێت جریوەیان بتاسێنێت،
دەستەڵاتێکی زاڵ دەتوانێت کەسایەتییەکان بکووژێت
لێ هەرگیز ناتوانێت پەیامیان لەناوبەرێت،
مێژووی ژیانی کۆمێدیای یەزدانیی دانتێ*
بە هەزاران ساڵ لە ژیانی دیکتاتۆرەکان گەورەترە
ڕووخساری مۆنالیزای داڤینچیی هەزارانجار
لە ڕووخساری سەرۆکەکان جوانترە،
سەرۆکەکان دێن و لەیاد دەچنەوە
ئەدەب و هونەر بنچکی گوڵن ساڵ لە دوای ساڵ سەوز دەبنەوە،
سەرۆکەکان تاڵن کەس لەسەر زاری خۆی نایهێڵێتەوە
هونەر نانی جۆیە، ئەدەب شەکرللەمە
ئاخر بۆیە سەرۆکان بە هەزار و ئەنجیلۆکانیش وێنەیان کەمە،

* دانتێ: دانتێی شاعیری گەورەی ئیتالیی سەردەمی ڕێنیسانس 1265 بۆ 1321 زایینیی. کۆمێدیای یەزدانیی یەکێکە لە هەرە شاکارە گەورەکانی، کە بریتییە لە 100 سرووود و چواردە هەزار بەیت. شارێک پڕ لە دەقی ڕەخنەی سیاسیی، کۆمەڵایەتیی، فەلسەفیی. پڕە لە بوێریی شاعیر دژ بە چەوساندنەوەی کۆمەڵ لەلایەن کەنیسە و پاشاکانەوە.

پۆستی ژمارە (178)
ڕێکەوتی 18.03.2007 کاتژمێر 17:49

من پێویستم بە کات زۆر بوو هەتا ببمە گەنجێ
گەنجێ، کە تیلەی لە دەوری خۆی دەڕوانێ،
هەنووکە گەنجێکم یەکپارچە تەنیا و بێکەس
بەدەر لە دید و هۆش نیمە هیچ کەس،
ددانی جیڕی هەرچیی سەگی دەستەڵاتە ڕووی لێمە
یاخییەکم تاراوگە لانە و جێمە،

پۆستی ژمارە (179)
ڕێکەوتی 19.03.2007 کاتژمێر 07:43

جیهان بۆیە بەو گەورەیییە دەدرەوشێتەوە
چونکە کەللەمان بچووکە
دەبێت دژ بە چەوساندنەوە ڕاپەڕیین
کات کاتی تێکۆشانە هەنووکە،
زۆرداران نە خاوەنی نیشتیمان نە خاوەنی نەتەوەن
بکووژن، بکووژی ڕاستیی، بکووژی هەق
بۆ خوێنڕشتن پڕ سووپان بۆ کۆمەڵیش بێ کردەوەن،
تاکە ئەرکێک لەسەرمان بێت بەختەوەرییە
تاکە ڕێگاش بۆ بەختەوەربوون ئازادییە،
بەختەوەر نابین هەتا ئازاد نەبین
سەربەخۆ نابین هەتا خاوەنی زۆرداربین،
زۆرداری سەوز، زۆرداری زەرد، زۆرداری ڕەش
هەموو چقڵی یەک دڕکستانن
گرتوویانە لێمان بەری خۆری گەش،
منی بندەستی چەوساوە ڕاهاتووم
هەرچییمبدەنێ بەبێ شانازیی وەریدەگرم
هەرچییش بدۆڕێنم بەبێ خەمباریی دەیدەم،
شانازیی ناکەم، کاتێک قوومێ ئاوم دەدەنێ هەتا نەخنکێم
خەمبارنابم ئەوکاتانەی کەلەپچەم دەکەن
ئەکاتانەی بە چۆڕاوگەی خوێنی زاممەوە لەدار دەدرێم،
شانازییتان پێوەناکەم، کە هەن
خەمبارم بە بوونتان
ئێوە لەوەتەی هەن ئەم نیشتیمانە بێ باوکەم هەتکدەکەن،
من زۆرییەنەیجار ئێواران ڕووخسارتان لە دیمەنی شاردا دەبینم
ڕەش وەک دەروونی شەو
بێ تروووسکە، پڕ لە تاوان، پڕ لە کۆچ و ڕەو،
کات هەموو برینەکان سارێژ دەکات
لێ مێژوو ئاواسەواری تاوانەکانتان لەسەر دیوارەکانی شار نەخشدەکات،
لە هەموو هەڵەیەک وانەیەک
لە لاپەڕەی هەر ڕۆژێکدا دێوانەیەک،
پێنووسێک دەدەمە دەستی لاوێک لەبری تفەنگەکەی

کووخێک بۆ لاوێکی دی لەبری کۆچ و بارەکەی،
پەیکەری ئەم جەماوەرە دەرووخێنین دەیانکەینەوە بە خۆیان
فێریان دەکەین ئازاد بن، شانازییە بمریت بۆ ژیان،
ئەم نیشتیمانە دەکەینە گوڵستان
نانێک بۆ من نانێک بۆ تۆ، قوربانی ناوت خاکی کوردستان،
پۆستی ژمارە (180)
ڕێکەوتی 20.03.2007 کاتژمێر 08:53

بۆنی بەهار دەکەم
بە سەری پەنجەی ناز گەمە لەگەل هەستەکانی ساڵ دەکەم،
لە باڵکۆنی تەنیاییمەوە، مشتێ گەنم بۆ چۆلەکەکان ڕۆدەکەم
دەمەوێت ماڵییان بکەم
دەمەوێت ئاوازی ڕۆحی تەنیام بە جریوەیان ئاشنا بکەم،
تاریک و ڕوون لەسەر لێواری باڵکۆنەکەم چاوەڕوانیان دەکەم
هەناسەم تێکەڵ بە شنەی "با"ی سپێدە دەکەم،
هەناسەم لە باڵکۆنەکەمدا دەبێتە هەورێکی سپیی بچووک
لە تەنیشتمەوە پاسارییەکان ڕووخساریان دەشۆن بە دەنووک،
بەخێربێن، ئەی هەناوی هەستەکانی پۆلا
خۆشمدەوێن وەکوو بەهار
ئێوە شەکراوی نۆتەن جێگاتان وا لە پیانۆی دلا،
شانزدە ساڵ بەرلەئێستا لەناو دوکەڵی بۆمبادا
لاوێکی باریکەلەی بەجێماو بووم لەژێر بارانی ئاگردا،
لە ناڵەدا بۆ ئازادیی دەگەڕام
لە ئاگردا، لە خوێن دا، لەناو دوکەڵی ناپاڵمدا
بۆ نیشتیمان سەراپای جەستەم دەبوو بە زام،
ئەی نیشتیمانە هەتکراوەکەم
ئەی کوردستانە لە خاچدراوەکەم،
لەوەتەی هەیت دەکووژرێیت
لەوەتەی هەیت لاقە دەکرێیت،
خاکێکی بێ باوکیت سەدان ساڵە بە گەرووی تینووی خوێنی زۆرداردا دەکرێیت،

پۆستی ژمارە (181)
ڕێکەوتی 21.03.2007 کاتژمێر 09:43

ئەوا نەورۆزە
کوردە لێت بێت جەژنە پیرۆزە،
ڕۆژی فەروەردینە
کاتی خۆشییە دوور لە شینە،
جەژنی ئاهورامەزدایە
گەورەییی وا لە دڵماندایە،
ڕۆژی لەدایکبوونی مرۆڤە
کاتی سەیران و ڤارڤە، *
فریشتەکان دێنە سەردانمان
ڕووناکن وەک گلێنەی چاوان،
نەورۆز جەژنی باوەڕە
پڕ لە خۆشیی دوور لە شەڕە،
جەژنی زەردەشتییەکانە
تیشکی خۆر ڕێگایانە،
ئاگر لە گشت لایەک ئەکەینەوە
خەم لە دڵ دوورئەخەینەوە،
با هەمووومان پێکەوە
سروشت ڕووناک بکەینەوە،
نەورۆزی خۆشییمان بێت
زەردەشت باوەڕ و ژیینمان بێت،

* ڤارڤ: هەواری هاوینە

پۆستی ژمارە (182)
ڕێکەوتی 22.03.2007 کاتژمێر 14:35

سپیی سپیی وەک ڕەنگی دیوارەکانی ژوورەکەت
ژوورێک پڕ لە زام، پڕ لە زایەڵەی ناوەکەت،
لە درەختێکی باڵابەرزی سپییکەلە دەچیت، وەک دار چنار
لە ڕۆحی خۆتدا نامۆیەکیت خاوەن ئازار ،
ئازاری ڕۆح، ئازاری ژیین
لە دەورت ڕاوەستاون درشت و ورد

بۆ ڕاکشانی بێدەنگت دەگریین،
دەگریین نایانەوێت جێیانبهێڵیت
کچێک دێت ئاوێزانت دەبێت، کچێکی دی ئارەقەی تەوێڵی دەسڕیت،
دەزانم ئەگەر بەئەستەمێک بۆتدەکرا چاوەکانت بۆ دەکردنەوە
بە بزەیەک هەرچیی خەم و گریانە لەبیرت دەبردنەوە،
دە هەستە باوانم وادەی کۆچ نییە
ئەگەر تۆ بڕۆیت ئیدی لێرە خەندە هیچ نیشتیمانێکی نییە،

پۆستی ژمارە (183)
ڕێکەوتی 23.03.2007 کاتژمێر 16:47

ئەم شەماڵی نامۆییە چییە یاریی بە پرچی درێژی تەنیاییم دەکات؟
بۆ هەر ڕۆژەی "با"یەک هەڵدەکات؟
جارێک لە تەنیاییدا دیلم دەکات
جارێکیش مەلەی نێو گۆمی غەمم پێدەکات،
بەخت هەمیشە هاوڕێی ئەوانە بووە، کە ئاسوودەن
بەشی من خەمە، لەگەڵ هەموو هەنسکێکی مندا
دەیان بەختەوەر زەماوەند دەکەن،
بەم ساکۆی* ژانەوە دەیان ساڵە بەڕێگاوەم
پێکانم شلی هەڵهێنانەوەن، کەچیی هێشتا چرایەکی نەکووژاوەم،

* ساکۆ: چیای ڕووتەن.

پۆستی ژمارە (184)
ڕێکەوتی 24.03.2007 کاتژمێر 15:56

ئەوە خۆشەویستییە پەیوەندییەکان نەمر دەکات
ئەوە هاوڕێیەتییە تا هەتایە دەست لە ملی تەمەن دەکات،
تۆ نە خۆشەویستییتکردووە، نە هاوڕێی هیچ کەسێکیش بوویت
دڕکێک بوویت لە سەرڕێگادا بە بنی پێی هەزاراندا چووبوویت،

تاکە ئەرکی ژیان بەختەوەرییە
ئەرکی تۆ بۆ خەڵکیی ماڵوێرانییە،
لەوەتەی هەیت بەناوی خۆشەویستییەوە، ئەشق هەتکدەکەیت
بەناوی ئازادییەوە ژیان شەرمەزار دەکەیت،
بۆ هەرکوێ چووم، من بەدڵ چووم
هاوڕێی ئەشق، ڕێبواری ڕێی ئازادیی بووم،
بۆ هەرکوێ تۆ هاتیت بە ڕقەوە هاتیت
سەرڕێگاکان پڕ لە زام بوون، کەچیی تۆ بەتەنگ ئازارێکەوە نەهاتیت،
دڵ کاڵایەک نییە بۆ کڕیین و فرۆشتن
هەستێکە دیاریی دەکرێت
ئازادیی دوکانێک نییە بۆ بازرگانییکردن
ویستێکە ماڵ و گیانی پێشکەشدەکرێت،

پۆستی ژمارە (185)
ڕێکەوتی 25.03.2007 کاتژمێر 20:12

دڵم هێند ناسکە بە شەماڵێک دەشکێ
ڕۆحم هێند ماندووە بە تووڕەبوونێک دەمرێ،
کە دەزانی دڵ و ڕۆحم لەسەر لێواری ئاوابوونن
بۆچیی هێندە ئازارم دەدەیت؟
کۆترێکم تەرە و ماندوو بۆ حەز بە قرتاندنی باڵم دەکەیت؟
لێگەڕێ بژییم، شەکەتم بە خەمەکانی ژیان
درەختێکی بێداڵدەم لە جێگایەک دەگەڕێم بیکەمە نیشتیمان،
من هەر ڕۆژەی پۆستێکت دیاریی دەکەم، تۆش ئازارێ
هەر ڕۆژەی برینێکت سارێژ دەکەم، دەتژەنم بە "نەی" بە فووی شمشاڵێ،
لێگەڕێ دڵت بکەم بە نیشتیمان
ئەشقت بە ئاوات
ناوت بە گلێنەی چاوان،
دەمەوێت تا دواهەناسە لەلات بم
وەک هیمۆگلۆبین لە خوێنتا
وەک ئۆکسجین لە سینەتا
دەمەوێت باڵاگەردانی باڵات بم،

پۆستی ژماره (186)
ڕێکەوتی 26.03.2007 کاتژمێر 21:44

لە پەنجەرەی ژوورەکەمەوە تێدەڕوانم
گەشیت وەک ژیلەمۆ
تەنیا دیارییت وەک دڵێکی شکاو و نامۆ،
تەنیا و گەش لە قوڵایی تارییکی شەودا
لە گووندێکی چەپەری دونیادا،
لێرەوە تێت دەڕوانم
دوورییت بە قوڵاییی خەمەکانی خۆم دەپێوم،
ئەم پۆستەت بە "با"دا بۆ دەنێرم
بە ڕەنگی برینەکانی ڕۆحم نووسراوە
نهێنیی قەتماغەی زامەکانمە پێتدەسپێرم،
بەدەر لە تۆ، کە لەوپەڕی گەردوونیت
کەسی تر شکنابەم جێی متمانە بێت
گەشیی ڕەنگی تۆ نەبێت کەسی ترم نەدیوە
ڕەنگ و شێوەی لە ئازاری برینەکانی من بچێت،

پۆستی ژماره (187)
ڕێکەوتی 27.03.2007 کاتژمێر 09:36

ئایندە هی ئەوانەیە، کە باوەڕ بە خەونەکانیان دەکەن
جوانیی خەونەکان لای ئەوانەیە، کە سەما لەگەڵ ئایندەدا دەکەن،
دەشێت بمرم و کەسێک نەبێت گوڵێک بێنێتە سەر گۆڕم
تەنیا لە شوێنێکدا گڵێک نیشتیمان بێت، لەگەڵ خۆمدا ڕەنگی ئەویش بگۆڕم،
بۆ هەرکوێ چووم، کەسێک نەبوو بە چەپکێک گوڵەوە بێتە سەر ڕێم
لێوان لێوم لە وشە، ئەدەب و هونەرە ژیان و جێم،
دڵێکی ڕۆح سووک لە هەمووان تەمەن درێژترە
پڕ کینەن ئێوە، دڵی ئێوە ماڵێکی سارد و سڕە،
ئەوەی خولەکێک تووڕەیی دێنێتە ژیانییەوە
شەشت چرکەی ژیانی دەدۆڕێنێت

ئەوەی ڕۆژێک بۆنی گوڵێکی نەکردبێت
بە گوێی ڕقدا دەچرپێنێت،
ئەوەی نیگای ئەستێرە و مانگی نەکردبێت
ژیانی بە مۆنیی دەڕەنجێنێت،
ئایندە هی ئەو کەسەیە بۆ ژیان دەمرێت
هەزارەها ساڵ فرمێسکی سەر ڕووی چەوساوان دەسڕێت،

پۆستی ژمارە (188)
ڕێکەوتی 28.03.2007 کاتژمێر 08:45

خاوێن وەک کلووی بەفری ساڵە دڵت
بە نەرمەپێ هەنگاو دەنێیت
کێ هەیە لەم ڕێگایەدا سەرنجی نەدابێتە دەست و پەنجەی سڕت؟
هەنگاو هەنگاو بۆ ژیان پێدەکەنییت
لەگەڵ هەموو هەنگاوێکدا
دەستی هیوایەکی نوێ دەگریت،
لەو ڕێگایەدا تۆ لە هیچ ڕێبوارێک نەدەچوویت
ڕووناکییت لێدەچۆڕا
ئەستێرەیەکی پێگرتوو بوویت،
هەندێک ڕێبوار کۆڵی ژیانیان لەسەر شان بوو
هەندێک ژن بوون، هەندێک پیاو
ڕووخساریان گەردی خەمی لێنیشتبوو،
ئەوان کۆمەڵێک گەورەی ژان لە دڵ
ئەتۆش منداڵێکی بچکۆلانەی شێوە گوڵ،
خۆزیا هەموو تەمەنت هەرئاوها منداڵبوویتایە
تەنیا جارێک چییە دڕکی ژیان نەیگەستیتایە،

پۆستی ژمارە (189)
ڕێکەوتی 29.03.2007 کاتژمێر 11:29

هەموو ڕۆژێک لەبەر ئەم پەنجەرەیەدا ڕادەوەستم
بیر لەو کاتە دەکەمەوە، کە "با" دەستی توونددەگرتم،
چکلێتە نامەیەکی دەدامێ

زەردەپەڕ خەمبارانە دەیگووت: ڕووخساری جارانت کوانێ؟
بیر لەو بەیانیانە دەکەمەوە، ئالێرەدا چاوەڕوانی هەڵهاتنی خۆرم دەکرد
"با" هەردوو دەستی وەک ملوانکە لە ملم دەکرد،
ئەو ئێوارانەم بیردێتەوە، خۆر لە کەژاوەی پرتەقاڵیی ئاوابووندا ڕادەکشا
منیش تنۆک تنۆک ئەشک لە چاوانم دەڕژا،
بیر لەو بوڵێلانە دەکەمەوە، کە چاوەڕوانی دەرکەوتنی مانگم دەکرد
کاتێک دەمدی دەریا پەڵاسی نێو دەمی ماچدەکرد،

پۆستی ژمارە (190)
ڕێکەوتی 30.03.2007 کاتژمێر 07:47

هاوڕێ لە کوێیت؟
تەنیا جارێک بە تەنگ ئەم برینە بەسوێیەمەوە بۆ نایەیت؟
هەستناکەیت بە شەکەتی ئەم دڵەم
بە کوێرەوەریی تەمەنم و
بە ئازارەکانی ئەم جەستە سڕەم؟
وەرە ببینە چەند نەخۆشم
تەنیایەکی لەوێدا کەوتوو
پەڕاگەندەیەکی زامدارە هەست و هۆشم،
هاوڕێ کەنگێ بۆ من پەیدا دەبێت؟
کەنگێ مەرهەمی سەر ئەم ژانە گڕگرتووەم دەبێت؟
بە هەموو تەمەنم تۆ جارێک چییە لە دەرگات نەدام
لە سووتانما لەوێ نەبوویت
لە گریەما دەستێکی سۆز نەبوویت
لەو ڕۆژەوە هەتا ئێستا ناڵەی "نەی"ە سەدام،
هەنووکە لە کۆڵانی شەهیدان دەچم
پێیەکم لە ئازاردایە پێیەکی تر بەرەو سبەی هەڵدێنم
لەملا خەم لەولاش هەر چاوەڕوانییە بەشم،
هاوڕێ وەرە لە پەنجەرەی ژوورەکەم بدە
تارییکی لە ماڵما دەربێنە، چرای بوونت لە ڕۆحما هەڵبکە،
وەرە هاوڕێم وەرە
ژیان بێ هاوڕێیەک لە گوڵێکی بێ بۆن دەچێت
ئەم پۆستەم لەگەڵ خۆتدا بۆ خاک بەرە،

ژیان بێ هاوڕێیەک لە شەمێکی دانەگیرساو دەچێت
ئەوەی هاوڕێیەکی نەبێت مرۆڤێکی خاک بەسەرە،
لەوەتەی هەم بۆتدەگەڕێم
بە درێژایی ئەم تەمەنە جارێک چییە نەهاتیتە سەرڕێم،
بە ئاگردا تێپەڕیم
بە شەختەدا هەنگاوم نا
هەمیشە دەبوایە بۆ لەوێ نەبوونت بگریم،
وەرە هاوڕێ
لەخۆ بگرە "با"ی ئەم تەمەنەم تەنیا جارێ،
پێمخۆشە بەر لە مردن تۆم هەبێت
بە سۆزەوە گوێ لە خوڕەی کانیی دڵم بگریت،

پۆستی ژمارە (191)
ڕێکەوتی 31.03.2007 کاتژمێر 09:26

وەک گەنجێکی سەر گۆشەی کۆڵانەکان
بوومەتە هاوڕێی بەرهەیوان و باڵکۆنەکان،
وەک شیعرێکی گەڕۆکی بێ ناونیشان
دراوم لە دیوارەکان،
بۆ هەرکوێ چوویت من هەم
دەنگێکم لە سەدای فەرهاد، چیرۆکێکم لە خەونەکانی کاکە مەم،
وەک سووتانی ئەوان بۆ ئەشق
کەوتمە بەر جەوری پارت، کەوتمە بەر بەرق،
سووتام بۆ نیشتیمان
درەختێکم باڵاکردوو بە ئەشقی کوردستان،
ئەو کوردستانەی تێیدا دەژییام و هەنووکە ئەو لە مندا دەژیی
ئەو کوردستانەی بەعس هەتکی کرد و پارتەکانی ئێمەش
دەست و قاچ و لووت و گوێچکەیان بڕیی،
با ئەو پێشمەرگەیە چیدی قاقا پێنەکەنێت
کە ئێمە هەموو بێ زمان و دەمی دەستی ئەوین
با ئەو سەردارە مژدە بە نیشتیمان نەدات
ئێمە هەموو هەتککراوی دەستی ئەوین،
نانی ئێمە دەخۆن و پێیانوایە، ئێمە نانی ئەوان دەخۆین

زەویی ئێمە داگیردەکەن و پێیانوایە، ئێمە لەسەر زەویی ئەوان دەژیین،
سەدەیەکی چەند قێزەونە، ڕەنگکراو بە ئەریستۆکراتی کورد
نۆکەریانن پۆلیسەکان هەر لە درشت هەتاکوو ورد،
ڕێگانادەم پێشمەرگەیەک بمهێنێتە پێکەنیین
لێوەکانم هێند وشکن بە قاقایەک هەڵدەوەرێن
ڕۆحم تەنافی خۆشییە خەندە و بزەی پیاهەڵدەواسرێن،
ڕێگانادەم دەستەڵاتێک بمکات بە سەگ
خاک خاکی خۆمە، نان نانی خۆمە، لەپێناویا دەبم بە ڕەگ،
دڵی ئەم خاکەتان کووشت، کوردستان خاڵیە
سەیرە دوای ئەم هەموو کارەساتە، کەچیی هەر ئەژیی،
ئەژیی و هیوای بە کەستان نەماوە
ئەی ئاهورامەزدا وەرە نەوەکانی زەردەشتت بەرەوە،
بەدەر لە خەم چێژیان لەم خاکە نەبینیی
هەموو کەسیان خۆشویست، کەچیی کەس ئەوانی خۆشنەویست
تاڵانچییەکان بەناوی ڕزگارییەوە هەتکیانکردن، ئەوان قاقا پێدەکەنیین
نەوەکانت دەمیان نەبوو بۆ پێکەنیین، قاقامان لەوانەوە نەبیست،
وەرە بیانبەرەوە سەدان هەزار ساڵە بەجێتهێشتوون
دیلی ئەهریمەنەکانی شەڕن، کۆت و زنجیریان لەپێ کردوون،
بیانبەرەوە لێرە ژیان بۆ ئەوان واتایەک چییە نەیماوە
دەیانەوێت بیانکەن بە سەگ
دەنەڕێنن بەسەریاندا پۆلیس و ئاغا و دەرەبەگ،

پۆستی ژمارە (192)
یەکشەممە ڕێکەوتی 01.04.2007 کاتژمێر 13:20

دوێنێ شەو لەژێر تریفەی مانگەشەودا ئاوێزانت بووم
ڕێبوارێ بووم لە باخی سینەتا ڕاکشابووم،
خۆزیا شەوەکانی ساڵ هەمووی ئاوها ڕۆشن دەبوون
مرۆڤەکان هەموو ئاشق
لە بووغز و شەڕ بەدوور دەبوون،
کە مرۆڤەکان هەردوو دیووی ژیانیان تەنیی بێت
لەملا بە بازووی چەوساوەکان کۆشکەکانیان هەتا کەشکەڵانی ئاسمان ڕاگرتبێت،

لەولا دەرگاکانیان بە پسوولەی باوەڕ و ئایین گشت داخستبێت
قووربەسەر ئازادیی چیی بۆ ماوەتەوە؟
کە لەملا کووتەکێک بێت بە دەستی دەستەڵاتەوە
لەولاش بەبێ عەبا، بێ کڵاو و مێزەر کەس بۆی نەبێت لاپەڕەیەکی لێهەڵبداتەوە،
ئای لەم ئازادییە هەتککراوە
لە بێویژدانی مرۆڤ، لە کڵپەی ئاگری ئەم تیرۆرە باوە،
لەم چەرخە هیچەدا، مرۆڤ یان کۆیلەی دەستەڵاتە یان هی ئایین
لەسەری گۆشەی هەموو کۆلانێکەوە مەرگێک دیارە
ئەوەی لەم خاکەدا نامۆ بێت پێیدەڵێن: ژیین،
شەقامەکانی سوور دەچنەوە بە تیرۆر
ئۆرگانی پارتەکان جمەیان دێت لە مرۆڤی گێل
لە سیاسەتمەنداری سەرشۆڕ،
بۆ هەرکوێ دەڕۆیت ئازادیی تێدا هەتکدەکرێت
بەدەم هەر منداڵێکەوە پێدەکەنیت، دەمی نییە بۆت پێبکەنێت
دەستی تەوقە بۆ هەر کەسێک درێژ دەکەیت، قۆڵی نییە بۆت ڕاگرێت،
نیشتیمانێکی چەند وێرانە
گوڵێک چییە تێیدا نارِوێت، داڵەکانی پارت، سیسارکەکەچەڵەکانی دەستەڵات
بۆ نەوەکانیان کردوویانە بە کوولانە،

پۆستی ژمارە (193)
دوو شەممە ڕێکەوتی 02.04.2007 کاتژمێر 15:26

دڵڕەقن، شەڕانگێزن
لەژێر سێبەری تۆدا داڵدە دەرێن
ونبوویەکی درەنگگر و بێڕێزن،
تەنام* من لەگەڵ ویژدانی خۆمدا
تەلانێکم* گالای* هیچ کەس نامجووڵێنێ
بێباکم لەوەی، کە دەیڵێم
با ئەمجارەش ژیین و ئەنوام* لێ برمێ،
ئاشەوانی دەستەڵات نیم هەتا مزەی* هیچ پارتێک وەربگرم
چەتەیەکی دەمامکردوو نیم هەتا سەرِ ڕێگا لە ئازادیی بگرم،
پەڕاگەندەیەکم بێ چەک و ماڵ
هەموو سنوورەکان دەبەزێنم بە خەیاڵ،

دەگەڕێم لەکوێ ئازادییەکی هەتککراوم دی دەرمانی دەکەم
لەکوێ کۆت و زنجیرم دی دەیپسێنم
دەبمە چرا لە تارییکرتیین ڕۆژی نیشتیماندا خۆم هەڵدەکەم،

* تەنا: ئاسوودە.
* تەلان: بەندەن، بەرزایی شاخ.
* گالا: هێرش.
* ئەنوا: جێگای حەوانەوە.

پۆستی ژمارە (194)
سێ شەممە ڕێکەوتی 03.04.2007 کاتژمێر12:23

ئەگەر ئیمڕۆ کۆمەڵ بکەن بە سەگ
سبەی وەک سەگیش دەیانتۆپێنن
ئەگەر ئیمڕۆ کۆمەڵ بکەن بە مێگەل
سبەی ئەژدیها نووستووەکەی ناو ڕۆحتان لە خەو هەڵدەستێنن،
دەبنە ئاگر ئەو ماڵەی ئاڕمی ئێوەی تێدانەبێت ئەیسووتێنن؟
دەبنە تەور گەردنی هەرچیی درەختی بێلایەن هەیە ئەیپەڕێنن؟
هێند دڵڕەقن وێنەتان لە وێنەی تاوان دەچێت
هێند زاڵن مەلێک چییە بە ئازادیی بە ئاسمانتاندا نافڕێت،

پۆستی ژمارە (195)
چوارشەممە ڕێکەوتی 04.04.2007 کاتژمێر 11:35

شەڕ لەگەڵ بێکارییدا خودای جوڵاند
ئادەمی بەرهەمهێنا
دەرگای شەڕێکی نوێی ترازاند،
شەڕ لەگەڵ بێکارییدا ئادەمی هاندا
خودا ناچار بکات تەماشای ژیانی ڕۆژانەی بکات
خودا بە میهرەوە ئاژەڵێک دیاریی ئادەم دەکات،
ئاژەڵ دادی ئادەمی نەدا
خودا نازانێت چلۆن وازیی لەگەڵ ئادەمی تاک و تەنهادا بکات،

حەوایەک بۆ ئادەم دەنێرێت
ماوەیەکی دوورودرێژ لە باخەکەیدا جێیاندەهێڵێت،
یەکەم هەڵەی خودا دروستکردنی ئادەم بوو
دووهەم حەوا
حەوا بێتاقەتیی نارەوێتەوە وەک ئادەم
ڕۆژێک دەچێتە سەر ڕێگای ماری هێرا،
چ نهێنییەکە خودا ناهێڵێت تووخنی درەختی زانست بکەون
لەم باخەدا هەموو شتتان بۆ هەیە، لێ لێناگەڕێن بە درەختی زانستدا سەرکەون،
ماری هێرا حەوا ئاوها دەدوێنێ
ئیدی حەوا نایەوێت کاری ئیمڕۆ بکاتە سبەینێ،
بەری درەختی زانست دەخوات
ئادەمیش لەگەڵ خۆیدا دەبات
ئەویش تامی بەری درەختی زانست دەکات،
ئیدی هەردووک بیردەکەنەوە
شەرم لە ڕووتیی خۆیان دەکەن
بە گەڵا و گوڵ داوێنیان دەپێچنەوە،
خودا، کە دەبینێ چیدی تەواو ڕووت نین
ملکەچی فەرمانەکانی ئەو نین،
لە باخەکەیدا فڕێیاندەداتە دەرەوە
لەو ڕۆژەوە شەڕی ئادەم و حەوا دەکات
ڕقی لە سەرپێچی نەوەکانی حەوا دەبێتەوە،
خودا ڕقی لە بیرکردنەوەی خەڵکییە
شەڕ بەرانبەر ئاشتیی دادەنێت
ئەو لە ئازادیی بیرکردنەوە خاڵییە،
حەوای ژن بوو ئادەمی پیاوی فێرە بوێریی کرد
فێری بیکردنەوە، فێری یاخیبوونکرد،
هەنکووکە ئادەمی پیاو حەوای ژن دەچەوسێنێتەوە
جەللادێکە وەک خودایەکی دڵڕەق ئەقڵ لە حەواکانی دەرەوەی بەهەشت دەستێنێتەوە،
ئادەمەکانی دەرەوەی بەهەشت ناپاکیی بەرانبەر حەواکان دەکەن
بوونەتە سەربازی خودا، حەواکان قات و قڕدەکەن،
کەس بەقەد خودا ڕقی لە ژن نابێتەوە
کەس وەک ئەو شەڕی بەهەشت بە جیهانەوە نابەستێتەوە،
ئەگەر خودا ژنی خۆشبویستایە ئیسلامی بۆ نەدەنارد
نەیدەکردە کۆیلەی پیاو، بە هاوڕێی شەیتان ناوی نەدەبرد،

باشتریین تۆڵە لە ژن بۆ خودا بە ئیسلامکردنی بوو
ناسۆرتریین سزا بۆ ژن لەلای خودا بە کاڵاکردنیان بوو،

* ئەم پۆستە لەژێر کاریگەریتیی "ئەنتی کریست"ی فریدریش نیچەدا نووسراوە.

پۆستی ژمارە (196)
پێنج شەممە ڕێکەوتی 05.04.2007 کاتژمێر 10:49

ئەوان، کە مرۆڤێک بەرشەق دەدەن
بە بەرچاوی خەڵکییەوە بەرکێبڵ و قامچیی دەدەن،
دواکات هەر لەوێشدا کۆمەڵ هەڵئەواسن
لە سووتانی دارستاندا درەختی تەڕ و وشک ناناسن،
وەک سەگ تەماشای کۆمەڵ دەکەن، وەک سەگ دەیانتۆپێنن
گەلە گوورگێکی دڕ و برسیین هەتا خوێن نەڕێژن وازناهێنن،

پۆستی ژمارە (197)
هەینیی ڕێکەوتی 06.04.2007 کاتژمێر 20:46

ئەگەر بۆم دەکرا دەبوومە مێشهەنگ
هەموو تەمەنم پەلاسی نێودەمی گوڵم ماچدەکرد
ئاشقێکی ڕاستگۆ دەبووم هەتا مردن دەمم لەسەر مژیین لانەدەبرد،

پۆستی ژمارە (198)
شەممە ڕێکەوتی 07.04.2007 کاتژمێر 21:33

تۆزقاڵەزەڕڕەیەک بوار نەماوە بۆ هەناسەدان
ئاگرێکتان کردۆتەوە هەتا کۆتا نەکووژێتەوە
بریینێکتان تیا دروستکردووم هەتا مەرگم دەکوولێتەوە،

پۆستی ژمارە (199)
یەکشەممە ڕێکەوتی 08.04.2007 کاتژمێر 18:37

بۆ (دۆنارت)

که تۆ له ڕەچەڵەکەوە بەخت ڕەش بوویت
هەموو تەمەنت هەر ئاوارەیت
که تۆ کوڕی تراژیدیا بیت
هەتا مەرگیشت هەر تاک و تەنهایت،
دایک و باوکی خۆت نەدی فڕێیاندایته دۆزەخی ژیانەوە
بەر له مەرگت نەیانهێشت کەس بتبینێت
دۆزەخێکی تریان بۆ نایتەوە،

پۆستی ژماره (200)
دوو شەممه ڕێکەوتی 09.04.2007 کاتژمێر 11:12

هەموو بەیانییەک چاوەڕوانی پۆست دەکەم
لێ ئەم بەیانییه چاوەڕوانی دەرکەوتنی تۆ
نیگام هەر لەسەر کردنەوەی دەرگاکەیه
دەمەوێت مەلی ئەم هەستەم بگریته خۆ،

پۆستی ژماره (201)
سێ شەممه ڕێکەوتی 10.04.2007 کاتژمێر 08:45

لەگەڵ نیگای سپیدەدا بۆنی گەردن و ملت دەکەم
لەگەڵ زەردەپەڕدا قۆڵەکانم به خەنەوانکەی سنگت دەکەم،
چلۆن پاییز درەختەکان ڕووت ڕووت دەکاتەوە
دەمەوێت ئاوها ڕووتت بکەمەوە،
چۆن بەفری ساڵ سنگ و مەمکی درەختەکان دادەپۆشێت
ئاوها دەمەوێت به چنگ مەمکەکانت داپۆشم
دەمەوێت ئاوێزانت بم
دەمەوێت خۆشاوی خۆشەویستییت بنۆشم،

پۆستی ژماره (202)
چوار شەممە ڕێکەوتی 11.04.2007 کاتژمێر 20:23

هەموو ساڵێک وەکوو بەهار چاوەڕێیت
وەک گوڵ و گوڵزار دڵڕفێنی سەرەڕێیت،
ساماڵێکی چوار وەرزەییت
وەک ئەستێرە و ڕۆژ و مانگ دەمەوێیت،

پۆستی ژماره (203)
پێنج شەممە ڕێکەوتی 12.04.2007 کاتژمێر 11:31

ئازادیی ویستە
کام بندەست هەیە نەیەوێت؟
کام کۆیلە هەیە خولیای نەبێت؟
ئازادیی هەڵویستە
کەم سەردار هەیە بییەوێت
ناپاک نییە نەیفرۆشێت،

پۆستی ژماره (204)
هەینیی ڕێکەوتی 13.04.2007 کاتژمێر 22:57

کامتان باشن تۆ یان ئەهریمەن؟
کامتان پڕ هیوان تۆ یان پرچی قەرسیلیی چیمەن؟
کامتان پڕ ڕەنگمان دەکەن جۆراوجۆر
تۆ یان تیشکی زێڕینیی خۆر؟
کامتان لێومان بە تریفە دەمژن وەک هەنگ
ئەی کامتان ژیانمان پڕ دەکەن لە جەنگ؟
ڕۆژێک گەنجێک هاتە لات
قاچێکی لە ئەژنۆیەوە پەڕیبوو
چاوێکی هەڵکۆڵراو
سەراپای لەشی شەلاڵی خوێن بوو،

گەنم ڕەنگ بوو، چاو قاوەیی
لە ڕووخساریا بەدی دەکرا
ئەشقێک وەک کلووی بەفر سپیی سپیی،
قاچێکی ڕەش و چاوێکی شیینت پێدا
وەری نەگرت
نە ڕێگاتدا بۆ بەهەشت
نە فرێتدایە جەهەننەمەوە
چرایەکی ئەنفالکراو بوو ڕێگات نەدا دایگیرسێننەوە،

پۆستی ژمارە (205)
شەممە ڕێکەوتی 14.04.2007 کاتژمێر 18:43

گەنجی ئیمڕۆ تابلۆکێشێکی شەکەتە
لە سروشتی سکێچی ئێوە زیاتر
هیچ شتێکی تر ناکێشێت،
کە دەیان ساڵە لە گۆڕستانی ئەو پەپوولانە ناڕوانێت
هۆی ئەوەیە دێوی خولیاکانی ئێوە ڕاودەنێت،
گەنج نیگای بۆ گوڵەکانیش نەماوە
بەدەر لە ڕووخساری تەماویی ئێوە
توانای کێشانی هیچی تری نەماوە،
هەتا ئێوە هەبن نیگای ئەو مەلە وشکبۆوانە ناکات
هەتا تێر لە ڕەشیی بوونی ئێوە نەڕوانێت
فڵچەی هیچ خامێک تەڕناکات،
شەو نییە بە دەفەوە
بە فلووتی کوون خۆڵاویی و
بە تاکێ کڵاشی دۆمیی و بە ڕانکووچۆغەی پەرتبووەوە
سەدان هەزار دارچناری سووتاو
سەدان هەزار گوڵەمێلاقەی هەڵکێشراو
گووندی بێداڵدە نەیەنە لای
سەدان هەزار سازی شکاو
دەیان هەزار تەپڵی دڕاو
بە لاوک و حەیرانەوە ڕانەوەستن لەبەر دەرگای،
نە تەماشای کەسیان دەکات

نە دەرگا لە کەسیان دەکاتەوە
نە بەڵێن دەدات بە کەسیان
نە چاوی تەڕی کەسیان ئەسڕێتەوە،
نیگارکێشێکی تووڕەیە گەنج وێنەی ڕشانەوەی سەردەم ئەکێشێت
ئەو هەموو گوڵانەی فەرامۆشکردووە
چاوەڕێیە بزانێت لە کام مەرگەساتدا ئاغاژنەکان کوڕیان دەبێت،
ئەم هەموو کوڕە دەمرێت نقە لە کەسمانەوە نایەت
ئاغاژنەکان کوڕیان دەبێت دەیان شەو فوو بە زووڕنادا دەکەین
تەپڵی سەرمان دەژەنین خەو بە چاوی کەسماندا نایەت،
ئەم هەموو پیاوانە دەمرن چاوی کەسمان تەڕ ناکەن
دەیان ساڵە ئەم نیشتیمانە هەتکدەکرێت
پرسیارەکان لە دەرگای هزری کەسمان نادەن،
کە ئاغا سەری پەنجەی بە ئاگری پیریی گەرم دەبێت
ژیانمان بە پرسە و خەم ڕەنگدەکەین
لەبەر دەرگای هەر ماڵێکدا دەیان مەڕ بۆ قوربانیی ڕیز دەکەین،
گەنج تابلۆکێشێکی تووڕەیە
چاوانی ئەو هەموو چرایە لە گۆڕستانی مێژوودا نابینێت
سروشتی دەستەڵات دەکێشێت
کەچیی ڕۆژێک بۆ ڕەنگکردنی چراکان دانانێت،
خەتای گەنج نییە، کە پەپوولە و چرا و گوڵ و نۆتەکان بێکەسن
خەتای گەنج نییە شەقامەکان ئارامیی ناناسن،
خەتای ئەوان نییە، کە کەس مەرگی گەڵاکان نانووسێتەوە
ئەوە سوڵتانەکانی شەڕن وادەکەن خەڵکیی تەنها ئەو مێژووە بناسن
کە پارتەکان دەینووسنەوە،

پۆستی ژمارە (206)
یەکشەممە ڕێکەوتی 15.04.2007 کاتژمێر 19:48

دوێنێ شەو موڵکی سەرخۆشەکان بوویت؟
بە ئارامیی منداڵێکی پانزدە ساڵان لێیپرسیت
بەبێ ئەوەی بەردی وشەیەک چییە تێیبگریت،
لێ تۆ خۆت بەرەبەیان چاوت نەدەچووە خەو
ئارامیی لێبڕیبوویت پرسیارەکانی دوانیوە شەو،

خۆت دەتگووت: پێویستە وازبهێنم
پێویستە  چیدی تۆوی هیچ پیاوێکی نەناس
لە ئینجانەی هەوەسەکانمدا نەڕوێنم،
لە پێخەفێکدا بەئاگا نەیەم، کە پێشتر قەت لەسەری نەخەوتبم
شەهوەتم تێکەڵ بە شەهوەتی پیاوێک نەکەم، کە پێشتر قەت لەژێریدا پاڵنەکەوتبێتم،
پێویستە من چیدی شەوان موڵکی سەرخۆشێکی نەناسراو نەبم
پێویستە وازبهێنم
پێویستە گوڵدانی ئارەزووەکانم چیدی بە چەکووشی پیاوی سەرخۆش نەشکێنم،*

* بۆ شاتسیی دایەنی گۆڵد، پاڵەوانی ڕۆمانی (شار)ی ئەلێساندرۆ باریکۆ.

پۆستی ژمارە (207)
دوو شەممە ڕێکەوتی 16.04.2007 کاتژمێر 23:30

لە ڕۆشنایی ژوورەکەمدا دەربکەوە
یان من دێم بەم ناوەختە لە ئامێزتا جێگەم بکەرەوە،
با ئیمشەو هەست بە دووریت نەکەم وەرە خەوم
بێزار نابم بە هاتنت
خۆت دەزانیت من هاوڕێی گیانیی بە گیانیی شەوم،
وەرە لام، ئیمشەو بێ تۆ نامۆم
ئاشقێکی چاو بە ئەشکم بە وێنەی مۆم،
وەرە لام ئەزییزم
من بەبێ تۆ مەلێکی ئێجگار لاواز و زییزم،
وەرە ئیمشەو لە تارییکیی ژوورەکەمدا تیشکێک بە
وەک یەکێک لە خەونەکانی شەو
هەتا گزنگ تاکە هاوڕێ و هاوسەرم بە،

پۆستی ژمارە (208)
سێ شەممە ڕێکەوتی 17.04.2007 کاتژمێر 15:45

ئەم شەڕە وەک گۆڕەپانێکی تۆپی  پێ وایە
تۆ یان تەماشاکەریت یان یاریی دەکەیت
یان ویستت هەیە بۆ دەستەڵات، یان ملکەچیی پەسەند دەکەیت،

تۆ ، کە گەرەکتە ئازاد بیت
پێویستە هێرشبەر بیت
تەماشاکەر لەم گۆڕەپانەدا کۆیلەیە
ئازاد گەمەی سیاسیی دەکات بەرگرییکەرێکی بێ وێنەیە،
هەنووکە تۆ باشترە هیچت نەوێت
وەک لەوەی بتەوێت هیچت نەوێت،
ویستی هیچ نەویستن بەرهەمی ئەقڵێکی ئازاد نییە
کۆیلەیە ئەو گەلەی خاوەنی ویستی دەستەڵات نییە،

پۆستی ژمارە (209)
چوار شەممە ڕێکەوتی 18.04.2007 کاتژمێر 18:00

لە دوورەوە تێتدەڕوانیم
چەکمەجەیەکی داخراو بووم دەتویست بە لەپی لێو بمکەیتەوە
دیلی تەنیایی بوویت، بە ڕزگارکەرت دەزانیم
سوارێکی دڵشکاو بووم
دەتویست لە باوەشتا ئاشتمبکەیتەوە،
هەرچییەک هات وتی من دوێنێ شەو مانگێ بووم
لە چەمی ئەشقی ئەودا مەلەم دەکرد
هەرچییەک هات ویتی من دوێنێ شەو گوڵەبەڕۆژەیەکی ڕووت بووم
لەبەر ئاوێنەی خۆری ئەودا پرچی ئاڵۆزم شانە دەکرد،
لەوڕۆژەوە ڕقت لە من و مانگ و خۆرە
نیگای کەسمان ناکەیت
تۆی تووڕە هەموومانت لا یەکجۆرە،

پۆستی ژمارە (210)
پێنج شەممە ڕێکەوتی 19.04.2007 کاتژمێر 22:55

سیی و پێنج دانە ساڵی ڕەبەق بارینی خوێن بە "با"وە
بەفری سوور، ڕەشەبای ڕەش
بە تەنافی مێژوودا قوربانییەکان هەڵواسراوە،
دوای سیی و پێنج ساڵ نەیانتوانی ڕووخساری ئەم خاکە بشێوێنن
نەیانتوانی دڕکی بیابان لەناوماندا بڕوێنن

شاخ و گووند و دەشت و دۆڵیان گەشمردە دەکرد
ئەیانبردین سەریان دەبڕیین
لێ ئەمەی ئێوە دەیکەن، ئەوان هەرگیز نەیاندەکرد،
ئێوە هەتککەرانێکی ترن
پێتان دەڵێن: ڕزگارکەر
کەچیی لە ئەوان بێئابڕووتر و دڵڕەقترن،

پۆستی ژمارە (211)
هەینیی ڕێکەوتی 20.04.2007 کاتژمێر 11:00

بۆ "شاتسی شێل"ی ڕۆمانی "شار"ی ئەلێساندرۆ باریکۆ.

ناسک بوویت، جوانیی ئەستێرە و مانگت هەبوو
بارییک بوویت، بەژنی گەنم و جۆت هەبوو،
ژیانی ئارەزووەکانت دەژیایت
لە ڕق و کینە نەبێت لە هیچی تر نەدەتۆرایت،
گوڵێک بوویت ڕێگات دەدا هەموو کەس بۆنت بکات
تا ئەو کاتەش لەسەر جێگا چاوەڕوانی مەرگی خۆتت دەکرد
ئاواتت بوو بەرلە مەرگ گەنجێکی جوان پەلاسی نێو دەمت ماچ بکات،
ماچیانکردیت هەتا دوا هەڵمژینی هەناسە
گەنجێک بوو لە جوانیی خۆر، کەللەی پڕ کردیت لە خۆزگە
دوای دەم بەردان، هەناویت پڕ کرد لە تاسە،
دکتۆرێک هات بە دەرزییەک کۆتایی پێهێنایت
مردنێکی خێرا مردیت
فریای هیچ وشەیەک نەکەوتیت،

پۆستی ژمارە (212)
شەممە ڕێکەوتی 21.04.2007 کاتژمێر 09:06

مرۆڤ ئەگەر ویستی گەیشتن بێت بە پارە
دەست بۆ پیسترین شت درێژ دەکات
مرۆڤ بوونیەتێکی دڕندەیە
لەگەڵ خۆیدا دەوروبەریشی پیس دەکات،

ڕێگا زۆرە بۆ گەیشتن بە هەبوونی پارە
تۆ یان بە پیسییدا دەڕۆیت یان چاوەڕوان دەکەیت
یان بینەرێکی سەرسووڕماویت
تەماشای دەستی پیسی پارەداران دەکەیت،
لەکوێت بوو ئەم هەموو کۆشک و تەلارە؟
کێڵگەکانی گووند، ڤێلاکانی فیرعەوناوای ناو ئەم شارە،
تۆ، کە هەتا دوێنێ هەژارێکی بێدەرەتان بوویت
پێشمەرگەیەکی ڕووت و برسیی
هیچ کەس نە لە بوونت نە لە ناوتی نەدەپرسیی،
هەنووکە خودایەکی بچکۆلانەیت
دەست بۆ گەڵ و خاک و سەرمایەی ئەم نیشتیمانە دەبەیت،

پۆستی ژمارە (213)
یەکشەممە ڕێکەوتی 22.04.2007 کاتژمێر 10:16

ئەو گوڵەی شەلاڵی خوێنە
حەڤدە بەهارە، تازە بووکێکی تەرەجە*،
هەر پیاوێک لە دوریەتی و بەردی تێدەگرێت
پیاوێکی تەریف* و تەرەسە*،
کە ئێوە دەبینم پیاوانی هیچ، شەرم لە پیاوەتیی خۆم دەکەم
کە گوێم لە دەنگتان دەبێت پیاوانی پووت
تک تک ئارەقەی شەرم دەردەکەم،
شەرم دەکەم، کە پیاوم
لە نیگای مەرگی دوعادا
ئازارێکی هەتککراوم،

* تەرەجە: تاک و تەنها.
* تەریف: گلاو.
* تەرەس: خوێڕیی، هیچ.

پۆستی ژمارە (214)
دوو شەممە ڕێکەوتی 23.04.2007 کاتژمێر 10:32

چەندم خۆشدەوێن بە بەرگی سەوزەوە
ڕێگا دەبڕن پڕ لە هیوان تفەنگ مێژووتان ئەنووسێتەوە،
چەندم خۆشدەوێن کچان
چەندم خۆشدەوێن ژنان،
پێشمەرگەی ئەم خاک و ئاوەن
هاواری قیژە سووتاوی ئەم نیشتیمانە هەتککراوەن،
کچانی دی قژیان لەبەر ئاوێنەدا شانەدەکەن
کەچیی ئێوە سروشت دەکەن بە ئاوێنە
کچانی دی ئاڕایشتی خۆیان دەکەن
کەچیی جوانیی ئێوە بەقەد باوەڕ و ژیانە،
دەستێکتان لە ملی تفەنگدایە ئەوی تر لە ملی خاکدا
بێبەشن لە چێژی ژیان
پێشمەرگەن ملوانکەی ژیانتان کردۆتە گەردنی کوردستان،
چەندم خۆشدەوێن کچانی پێشمەرگە
نیگارکێشن سروشتی کوردستان دەکێشن
بوونەتە چرا بێ بەرانبەر دەسووتێن بۆ کۆمەڵگە،

پۆستی ژمارە (215)
سێ شەممە ڕێکەوتی 24.04.2007 کاتژمێر 13:14

بە بەرد ژن دەکووژن
چونکە لای ئەوان ژن شەیتانە
بە دەیان پیاو یەک ژن دەکووژن
چونکە کووشتنی ژن لای ئەوان فەرمانی یەزدانە،
وەک ئەوەی گەورەیی خودا لە کووشتنی ژندا بێت
وەک ئەوەی خودا دوژمنایەتی لەگەڵ حەوادا بێت،
بە بانگی "الله اکبر" ژن دەکووژن
ژن قوربانیی باڵادەستیی پیاوە
گیاندارێکە بۆ سەربڕیین وەک مەڕ و بزن،
ژنان نەوەی حەوان

سنوورەکانی قەدەغە دەسڕنەوە
مەلیکی لە بەهەشتەوە هاتوون دلڕەقیی خودا ئەگێڕنەوە،
هەستی ژنێک لە پەڕەی گوڵ ناسکترە
دەرپێی ژنێک لە باڵادەستیی پیاو ئابڕوومەندترە،

پۆستی ژمارە (216)
چوارشەممە ڕێکەوتی 25.04.2007 کاتژمێر 09:45

بەیانیی تەپە تەپ، بەیانیی زوو زەنگ ... زەنگ
چاوەکانم هەڵگلۆفیی دەرگای ماڵم کردەوە
دیم پۆستەچییەکەمە سەراپای گیانی شەلاڵ بوو لە دەنگ،
پۆستێکی دامێ ئەدرێسەکەی بە خوێن نووسرابوو
زەرفێکی دامێ تەواو لە غەدر هەڵکێشرابوو،
غەدری کۆمەڵێک پیاو
کەلپەیی* کۆمەڵێک ئەقڵ ناتەواو،
پۆستەچییەکەم شۆڕابەیەک* بوو لە خەم و گریان
تەویڵی سوور، پەنجەکانی سوور
ژنێک بوو لەسەر سنگی نووسیبوو ویژدان،
وتم ئەی ژن کام ویژدان؟
وتی هی مرۆڤ هی خودا
وتم لەوێندەر مرۆڤ نەبوو، خودا نەبوو
ئەوانەی لەوێندەر بوون
کۆمەڵێک ئاژەڵی کێویی، کۆمەڵێک پیاوی پووت* بوون،
سەرهەڵبڕە و بڵێ: ئەی خودا
مەرگێکی ئاوها پوویلانەت* بوو بۆ تازە بووکێکی وەک دوعا،
ئەی تۆڵەسێنەرەوەکە، ئەی خودا دلڕەقە
ئەی ڕقهەڵگرتوو لە حەوا
ئەی تەماشاکەری مەرگی دوعا،

*کەلپەیی: ڕەفتارکردن بەشێوەی سەگ.
* شۆڕابە: لقی شۆڕی درەخت هەتا سەرزەویی.
* پوویلانە: دیاریی بۆ تازە زاوا و تازە بووک.

**پووت: بەتاڵ، خاڵیی. مەست لێرەدا لە خاڵیی بوونی مرۆڤە لە ئەقڵ زۆرتر بۆ پیاو بەکاردێت.**

*** دوعا: ئەو کچە حەڤدە ساڵە ئێزیدییەی، کە لە موسڵ لە 17.04.2007 دا لەسەر ئەشق بە بەرد لەلایەن دەیان پیاوی پووتەوە کووژرا.**

**پۆستی ژمارە (217)**

**پێنج شەممە ڕێکەوتی 26.04.2007 کاتژمێر 13:14**

**حەڤدە بەهار بوویت هاوڕێی تۆ لە نیشتیمانێکی پاکدا**
**ژیان بە قاقا دەباتە سەر**
**تۆش لە جەنگەڵی باڵادەستی پیاودا بە بەرد دەتکووژن ئەی خاکم بەسەر،**
**سپیی سپیی بوویت لە پاکیی**
**خاڵیی خاڵیی بوویت لە ڕق**
**لێوان لێو بوویت لە ئەشق، ئەی شەهیدی خۆشەویستیی،**
**تۆ حەوایەکی دەرکراویت لە بەهەشت**
**خودا ئەو دەم نەیتوانی بتکووژێت**
**خودا لە باخەکەی خۆیدا نەیتوانی بەردەبارانت بکات**
**بە درەختی زانستدا هەڵتواسێت،**
**هەنووکە لە زەماوەندی بەردبارانکردنی تۆدا، خودا سەمایەکی ئەفسووناویی دەکات**
**پیاوێکی سەرخۆش و تووڕەیە، گاڵتە بە کووشتنی تۆ دەکات،**
**بە تووڕەییەوە پێکەکەی فڕێدەداتە ناو ئاگردانەکەی بەردەمی و دەڵێ:**
**هەتا من هەبم بە نەوەکانی ئادەم، نەوەکانی حەوا دەکووژم**
**حەوا ئەقڵی دایە دەست ئادەم**
**منیش ئادەمییەکان دەکەمە حەواکووژەکانی سەردەم،**
**دوعا حەوایەکی مۆدێرنە لە پیاو و خودا و ئایین یاخیی بووە**
**ئازارێکی لە خوێندا فڕێدراوە، سەراپای لاشەی گوڵی ئەشقی گرتووە،**
**خودا چێژ لە ئازار وەردەگرێت پیاویش وەک ئەو**
**پیاوان نۆکەری خودان، هیچ شەوێک بەبێ تاوان چاویان ناچێتە خەو،**
**خودا لە ئەقڵی مرۆڤ تووڕەیە، ئەقڵ بکووژی ئەوە**
**پیاو لە ژن بە قینە، ژن لانکەی هێمنیی شەوە،**
**خودا تۆڵەسەندنەوەی خۆی لە حەوا دایە دەست پیاو**
**لەوڕۆژەوە هەتا ئێستا ژن درەختێکە سووتێنراو،**
**لە بەهەشت و لەسەر زەویی ئازارێکە نقوومی تەرەداو،**

*تەرەداو: دەرکردن بۆ هەمیشە.

پۆستی ژمارە (218)
هەینیی ڕێکەوتی 27.04.2007 کاتژمێر 18:56

هیچ جێگایەکم لەم قووژبنە زیاتر نەدۆزییەوە
تێیدا بیر لە تۆ بکەمەوە
هیچ شوێنێک هێندەی ئێرە هێمن نەبوو
هیچ دەنگێک بەقەد دەنگی تنۆکی ئاو
سەمفۆنیای کۆکردنەوەی ئازارەکانی تۆ نەبوو،
من بیرت لێدەکەمەوە هەتا لە کەوتنتدا دەنگ هەڵبڕم
تەماشای تابلۆی مەرگت دەکەم، کە هەموو هۆکارین تێیدا
دەمەوێت ئێستا لێرەدا بێدەنگیی ئەم دەستەڵاتە بەدەستی خۆم سەربڕم،

پۆستی ژمارە (219)
شەممە ڕێکەوتی 28.04.2007 کاتژمێر 11:30

چەند دەمەوێت ئازارەکانت بە ترازووی ویژدان بپێوم
هیچ کێشانێک شکنابەم لە "تا"ی ئازارتا
هیچ ئازارێکی دی بەقەد وێنەی مەرگی تۆ
تەڕ ناکات گلێنەکانی هەرتک چاوم،
لە باڵەخانەی ئەم دوورییەوە تەماشای زۆر ئازارم کردووە
لێ هیچیان وەک تۆ نەبوون
هیچیان بەقەد تۆ پڕ هاوار نەبوون
خوا بەردی تێدەگرتیت
خوا تفی تێدەکردیت،
خوا کردبوویتیە پێڵاو
لەپێی ئەم پیاو دەریدەهێنایت
لەپێی پیاوێکی تری دەکردیت،

شەڕی ژن شەڕە لەگەڵ خودادا
ئەی ژن: تۆ ئەگەر بتەوێت پیاو نەویی بکەیت
پێویستە خودا بکووژیت
بگەڕێیتەوە بۆ بەهەشت، لەوێ بە ماری "هێرا"
خودا بە داری زانستدا هەڵبواسیت،

پۆستی ژمارە (220)
یەکشەممە ڕێکەوتی 29.04.2007 کاتژمێر 09:36

بە ناوی "دوعا"ی گەورە و میهرەبانەوە

ئەگەر ئەم بەردبارانکردنە نیشانەی پیاوەتییە
ئەوا حاشا من پیاو نیم
ئەگەر ئەمجۆرە کووشتنە نیشانەی خودا پەرستییە
ئەوا حاشا من ئادەمیی نیم،
ئەگەر ئەم دڵڕەقییە نیشانەی مرۆڤایەتییە
ئەوا حاشا لە ئێوە من ئاژەڵێکی کێوییم،
ئەگەر دوعا نەنگیی ئێوە بێت
ئەوا من دەنکێ زیخی ژێرپێیم،

پۆستی ژمارە (221)
دوو شەممە ڕێکەوتی 30.04.2007 کاتژمێر 13:13

تۆ کۆیلەیەکی گەمژەیت
نانی گێلێتیی دەخۆیت،
پێتوایە ئازادیت، ستایشی کۆت و زنجیر دەکەیت،
بکووژی دوعایت
دڕندەیەکی کێویی، چەقۆیەکی تیژ و نابینایت،
پاسەوانی بەرد بوویت، کاتێک ئازادیی هەتکدەکرا
پاسەوانی شەق بوویت، کاتێک دوعا شەهید دەکرا،
تۆی پۆلیس پاسەوانی تاوانیت
دڕندەیەکی چەکدار و دوژمنێکی سەرسەختی ژنانیت،

پۆستی ژماره (222)
سێ شەممە ڕێکەوتی 01.05.2007 کاتژمێر 12:00

**باڵای هیچ ئایینێک ناگاتە پاژنەی پێی کەوشەکانت**
**لووتکەی دەستەڵاتی هیچ سۆزانییەکی سیاسیی**
**ناگۆڕمەوە بە یاقووتی ئازارەکانت،**
**دەرپێ ڕەشەکەت لە ڕووی سەرۆکێک سپییترە**
**ناوی تۆ لە مێژووی ڕەشی ئەوان گەورەترە،**
**حەوایەکی خەڵتانی خوێنیت**
**بە چپە ڕاستیی ئەدوێنیت،**
**ئەو ڕاستییەی پیاوانی کوێر نایدۆزنەوە**
**ئەو ڕاستییەی کورتەباڵاکانی دەستەڵات خۆیانی لێدەشارنەوە،**

پۆستی ژماره (223)
چوارشەممە ڕێکەوتی 02.05.2007 کاتژمێر 09:24

**کاتەکانم وەک گڤەی "با" لێدەڕۆن**
**بەدوای ئازارەکانمدا ڕادەکەم، خەمەکانم لە مێژووی سیی و حەوت ساڵەمدا**
**کۆمەڵێک ژانی باڵگرتوو و سەرەڕۆن،**
**دەمەوێت دەست لە پەنجەرە نادیارەکانی مەرگ بدەم**
**دەمەوێت لەژێر خۆری نادیاری مەرگدا کەپرێک بۆ تەنیاییم هەڵبدەم،**
**ئاخۆ لەوێ کێ ببینم؟**
**ئەوانەی خۆشمویستوون**
**ئەوانەی هەرگیز بیرم نەچوون**
**ئەوانەی وەک یادگارێک لە پەڕاوی بیرەوەرییمدا هەڵمگرتوون،**
**ئەوانەی جارێک چییە ئازاری مرۆڤیان نەداوە**
**ئەوانەی بە ژیان باجی ئازادییان داوە،**
**دوعا دەبینم دوعا بۆ ئەشق دەکات**
**ئەشق خۆی دەبینم تف لە پیاوی هیچ دەکات،**
**ژنان دەبینم "بالە" بە تۆپی پێکەنین دەکەن**
**مردنێکی ئازاد مردوون، مەرگ ماچپرژێن دەکەن،**

دوعا دەکەم دوعا بەرەوڕووم بێت
بەدەم قاقای ئەشقەوە دەستم بگرێت،
دوعا دەکەم دوعا بێت لەگەڵ خۆیدا بمبات
دەرمبهێنێت لەم ئازارە
لەدەست دڕندەی ژیان ڕزگارم بکات،

پۆستی ژمارە (224)
پێنج شەممە ڕێکەوتی 03.05.2007 کاتژمێر 11:48

بەرد و خودا و پیاو
هەرسێکیان یەک ماددەن
هەرسێکیان مێشک دەپژێنن لەناکاو،
خودا و پیاو ڕەقن وەک بەرد
لە ئاستیاندا وەک پەڕەی گوڵن
گابەردی شاخ و هەرد،
بەرد فەرمانەکانی خودا و مرۆڤ جێبەجێدەکات
بیکەن بە بینا یان مێشکی پێبپرژێنن
بیکەن بە ڕێگا یان گۆڕ و زیندانی پێهەڵپەسێرن،
بۆ ئەو وەک یەکە
ئەو بەردێکە لە هەموو بەکارهێنانێکدا چوون یەکە،
ڕەقە وەک خودا
ڕەقە وەک پیاو
ئەپیرژێنێ کەللەی سەر
جەرگی "دوعا" پڕ دەکات لە زووخاو،
ئەو بەردێکە نەخشی ناو دیوارێک بێت یان بە ڕەنگی خوێن سوورکراو
سووپاسی خودا دەکات
بەردێکە وەک چەکی کووشتن بەکارهێنراو،
بەرد شانازیی خۆی لە هاویشتنیدا دەدۆزێتەوە
مرۆڤ لە خڕکردنەوەیدا
خوداش ئاسەواری هەڵگرتن و هاویشتنیان دەسڕێتەوە،

پۆستی ژمارە (225)

هەینیی ڕێکەوتی 04.05.2007 کاتژمێر 23:07

هەتا جارێک بە ڕووومدا هەڵدێی
"دە"جار لە پشتی کۆمەڵێک هەوری تەڵخەوە دەردەکەویت ئەی خۆر
من شەکەتێکی ئەم ڕێگایەم
وێڵی ژیانم بە دەیانجۆر،
قەت نەتهێشتووە ئارام بم
نەتهێشتووە ساتێک چییە هاوڕێی شەپۆل و کەنار بم،
ئەو شەپۆلانەی دەمبزوێنن بۆ دواندن
ئەو کەنارانەی هاوڕێمن بۆ لاواندن،
هەنووکە دوورن لێم
منی ماندوو نایانگەمێ، هێزی ڕۆیشتنیان نەماوە ئەژنۆ و پێم،
لە پشتی تەڵخی ئەو هەورانەدا خۆت حەشارداوە
تەرزە و باران ئەم تەزێنێ، هەرچیی مەیلی دەرکەوتن هەبێت نەتماوە،
ئای کە ماندووم
ئازار تەنمی ڕووتکردۆتەوە
بۆیە ئێستاکە ونبوویەکی لە خەمدا نووستووم،

پۆستی ژمارە (226)
شەممە ڕێکەوتی 05.05.2007 کاتژمێر 14:29

سەرم یەکپارچە پوورەی ژانە
ڕۆژەکانم بە تارییکیی بەسەر دەبەم
ئێستانێ مەرگ لای من ژیانە،
من تەنیاترین نووسەری ئەم جیهانەم
نامۆترین پەڕاگەندەی ئەم هەوارەم،
پێمخۆش نییە لێرەم
من لێرەدا ئازارێکی فڕێدراوی بێچارەم،
مەرگی خۆم پێویستە
ژانێکی بێ ناونیشانم
بۆیە تەنیاییم لا خۆشەویستە،

پۆستی ژماره (227)
یەکشەممە ڕێکەوتی 06.05.2007 کاتژمێر 14:00

چەندیین ڕۆژه ئەم پێخەفه دڵسۆزترین کەسمه
ڕق داگیریکردوویت ئەزیزم من دەزانم
ڕقت لە دەنگی هەناسەشمە،
ویستم نییە لە خەو هەڵبستم
دەزانم لە بێئاگاییدا ئاسوودەترین مرۆڤی ئەم ژیانەم
ئاشقی بەختەوەریی و مەلێکی بەرزەفڕی ناو ئەم پۆستانەم،
پۆست دەبەم پۆست دەهێنم
پێکەنیین دەبەمە زیندانەوە، جەللادەکان دەگریەنم،
لەوێڕا ئازارێک بەدی دەکەم
لێرەڕا ژانەکانی دەنووسمەوە
لەوێڕا سێدارەیەک دەبینم
لێرەڕا گەردنەکەی ناوی دەخوێنمەوە،
ئەو گەردنەی هەتا دوێنێ هاوڕێی قۆڵی کیژێک بوو
ئەو لاملەی، کە هێشتا جێگا ماچەکانی کیژێکی پێوە دیار بوو،
تەمەنمان بۆ نووسینەوەی مێژووی ژیان کورتە
ڕق داگیری کردووین، وەره ئەزیزم با ئەم پۆستە بۆ خۆشەویستیی بنووسیین بە جووتە،

پۆستی (228)
دوو شەممە ڕێکەوتی 07.05.2007 کاتژمێر 10:22

چاوەڕێی هەڵهاتنی خۆرم
سەردەمێکە مرۆڤێکی ڕەقبۆوەی بەر سەرما
تێکەڵەیەک لە ئازاری هەمەجۆرم،
پەنجەرەی ژوورەکەم خستۆتە سەرپشت "با" ڕادەمووسم
مەمکەکانی توند دەگووشم
من بەبێ دڵداریی "با" پەڕاگەندەیەکی دووره دەست و بێچارەنووسم،

پۆستی ژمارە (229)
سێ شەممە ڕێکەوتی 08.05.2007 کاتژمێر 09:19

تەماشای هەرچییەک دەکەم لێم دەبێتە دوعا
ئەگەر بە نەرمیی ڕووخساری"با" ڕامووسم
ئەو دەبێت بە گڤە و دەچێت بە گژما،
لە گوڵێک نزییکدەبمەوە بۆنی بکەم
"با" لە دەستمی دەڕفێنێت
دەترسێت نەبادە تفێکی لێبکەم،
دەمەوێت خۆر ماچبکەم
"با" بە هەورێک دەیشارێتەوە
دەترسێت نەبادە هەتکی بکەم،
نیگەرانم بە خەمباریی لەسەر بەردێک دادەنیشم
بەرد دێتە گۆ و دەڵێ: هەڵمبگرە و بمدە بە نێوچەوانی "با"دا
یان بمکێشە بە قاچە ڕووتەکانی خۆردا،
ڕادەچڵەکم و هەڵدەستم، ئەو قاقا پێمپێدەکەنێت
پێدەکەنێت و دەڵێ: لە دڵی هەموو پیاوێکدا بەردێکی نووستوو هەیە
ژنان لە خەوی هەڵدەستێنن
پیاو هەڵیدەگرێت و دەیدات بە تەوقەسەری ژندا
بەردەکان کۆدەبنەوە ئاهەنگی خوێن دەگێڕن،
ڕادەکەم و دەمەوێت بگەمەوە ماڵەوە
پۆلیسێک ڕاوەستاوە پێمدەڵێت ئەو بەردەی دەستت فڕێبدە
دەحەپەسێم بەرد لە دەستم بەردەبێتەوە
کەلەپچەیەک دەکەنە دەستم دەڵێن چیدی بۆت نییە بێیتە ژوورەوە،
هەناسەیەک ڕووخسارم دەپێکێت
هەناسەیەک بیرەوەریم لە چوارچێوەیەکدا هەڵدەگرێت،
تەماشا دەکەم چواردەورم بە پۆلیس گیراوە
لەسەر سینەی هەریەکێکیان ناوی دوعا نووسراوە،
دوعایەک لێم نزیکدەبێتەوە و دەڵێ:
تۆ دواهەمیین پیاوی ئەم مەملەکەتەی بە تاوانی بەرد دەتگرین
ئیدی لەودیوو تەلبەندەکانەوە دواوێنەت بە فلچەی ژنێک دەکێشین،
ژنان فەرمانڕەواییی دەکەن
ئاسەواری شەڕ دەسڕنەوە،
ژنان حوکمڕانیی دەکەن

ئاگری خوێن ئەکووژێننەوە،
بەرد لە دەستی پیاوەکان دەستێنن
جیهانێک لە ژن پێکدێنن،
بە ماشێنێکی پەمەیی دەمگوێزنەوە
ژنەکەم ماڵئاواییم لێناکات
بە شاردا دەمگێڕن پیاوێک چییە نایدۆزمەوە،
جیهان ئێستا هی دوعاکانە زیندانیش هی پیاو
ئاسەواری پیاو دەسڕنەوە، تاریکیی بەڕێدەکەن
ژیان پڕ دەکەن لە هەتاو،

پۆستی ژمارە (230)
چوار شەممە ڕێکەوتی 09.05.2007 کاتژمێر 10:44

بە ناوی ڕزگارکردنەوە نیشتیمان هەتکدەکەن
بە ناوی ئازادییەوە هەڕەشە لە بیروڕا دەکەن
بە ناوی ئابڕووەوە ژن بەردباران دەکەن،
ئێوە هیچ نین بێجگە لە سەرکووتکەرانێکی تر
هیچ نین بێجگە لە دەستەڵاتێکی زاڵی تر،
نیوەشەو بە دەمامکەوە سەری ئازادیی دەشکێنن
بە زمەی تفەنگ لە سەیران و گەشتەکانتاندا زمانی دەربڕیین ئەبرژێنن،

پۆستی ژمارە (231)
پێنج شەممە ڕێکەوتی 10.05.2007 کاتژمێر 09:03

لە هیچ شوێنێکەوە تروسکایی نابینم
سەرمای نان، سەرمای ژیان، سەرمای ئازادیی، دەست و پەنجەم دەتەزێنن
ئاگام لێیە ئازارەکان بە چپە یەکتر دەدوێنن،
ئازارێکی کۆچەرییم، ڕەگم لێرەیە و لە شوێنێکی تریشم
چەند دووربکەومەوە لە خاک، کەچیی هێشتا هاواری هەموو ژانێکی دەبیستم،

مرۆڤ پێویستی بە باڵە ئەگەر حەز بە فڕیین بکات
مرۆڤ پێویستە دەنگ هەڵببڕێت ئەگەر بیەوێت سەر کەچ نەکات،
مرۆڤ پێویستی بە ئازادییە ئەگەر بیەوێت سەربەست بژیی
پێویستی بە ئاسوودەییە ئەگەر بیەوێت هەموو تەمەنی پێبکەنێت و قەت نەگریی،

پۆستی ژمارە (232)
هەینیی ڕێکەوتی 11.05.2007 کاتژمێر 11:43

هەر بەردێک لەسەر ڕێگادا ببینم بە نووکی پێ دەیجووڵێنم
هەر مرۆڤێک هاتە سەر ڕێم بە ئازادیی دەیدوێنم،
تەماشای هەموو لەوێدابوونەکان دەکەم
دەست بۆ هەموو دەمێکی داخراو درێژ دەکەم،
هەموو خەوتوویەک ڕادەچڵەکێنم
لە هەموو باخێکی ڕووتدا چەندەها گوڵ دەچێنم،
بجووڵێن دەنگتان بێت هەتا بۆن و بەرامەتان ئاسوودەمان بکات
کار بکەن یاخیی بن هەتا مێژوو بە خۆراکی سبەینێمان نەکات،
من نامەوێت کرێکاری سەر مەکینەی کارگەی دوارۆژ بم
دەمەوێت ژیانی ئێستا بژییم نەک سەربازێکی دڵڕەقی ناو مێژوو بم،
ئەم مێژووە کووشتن پەسەند دەکات
تیرۆریست بیت ئیسلامیست بیت یان ئایندەخواز ئەو هەقی کووشتنت پێدەدات،
مرۆڤ هێند بێبایەخ بووە جیاوازیی نێوان تیرۆریستێک و ڕزگارکەرێک نەماوە
جەللاد و قوربانیی پێناسی ڕەسەنی خۆیان فڕێداوە،
هەردووک هەقی کووشتن بە خۆیان دەدەن
ئەمە سەدەی بیست و یەکە، مرۆڤەکان باز بەسەر لاشەی یەکتردا هەڵدەدەن،

پۆستی ژمارە (233)
شەممە ڕێکەوتی 12.05.2007 کاتژمێر 19:39

بەم ئێوارەیە دەمەوێت بیرت لێبکەمەوە، هەورێکی تەڵخ بەری بیرکردنەوەم دەگرێت
دەمەوێت وێنەیەکت بە خەیاڵ بکێشم
"با"یەک دێت و فڵچەکانم لەگەڵ گڤەیدا هەڵدەگرێت،
دەمەوێت نامەیەکت بۆ بنووسم

پۆستەچییەک دێت و پێنووسەکەم لەدەست وەردەگرێت،
ئاخۆ خەتای منە یان هی تۆ، وا لەم ڕۆژەدا لێت تووڕەم؟
دێرێک خۆشەویستییت لە مێژووتدا نەهێشتۆتەوە
ئەوەتا هەتا ئێستا زایەڵەی ئەو ئازارە سڕەم،
بەم ئێوارەیە هیچ شتێک لە دیارییەک بۆ تۆ جوانتر نییە
لێ نە ئازارت ڕێگام دەدات، نە منیش ئێستاکە ئەو کوڕەم،

پۆستی ژمارە (234)
یەکشەممە ڕێکەوتی 13.05.2007 کاتژمێر 20:05

فێنک بێجگە لە دەنگی سروشت دەنگی هیچی تر نایەت
چاوم بە ورشەی درەخت نەبێت بە ڕووی هیچی تردا هەڵنایەت،
ئەوە نۆتەی کام مۆسیقایە بەقەد جریوەی تۆ جوانە ئەی بولبول؟
ورووژاندووتە ئەقڵ و هۆشم، پڕ سەمات کردووە هەواری دڵ،
وەرە ئەی بولبول
وەرە بفڕە لەم چڵ بۆ ئەو چڵ،
چەند جوانیت بە قەدی ئەو درەختەوە
منت یەکپارچە بە خۆتەوە بەستۆتەوە،
ئەژنۆم نییە بڕۆم
لە کەناری ئاوازەکانتدا سەمایەکی کلاسیکیی سەرەڕۆم،
بخوێنە
بمدوێنە،
تۆ مۆسیقایەکی جاویدیت، وەرە ئیمشەو لە نۆتەیەکتدا بمنوێنە،

پۆستی ژمارە (235)
دوو شەممە ڕێکەوتی 14.05.2007 کاتژمێر 20:34

ئێراق وڵاتی خوێنە
لەوەتەی ئەهریمەنەکانی شەڕ، بۆ دیتنی ڕووخساری خۆیان، کردوویانەتە ئاوێنە،
ئێراق کێڵگەی خوێنە
مەرگ باڵادەست، ئازادیی تێیدا بێ شوێنە،
ئێراق نیشتیمانی تیرۆریستە
ئەوەی نەیەوێت ئازادییە،

ئێراق دێوێکی تینووە جۆگەی خوێنی پێویستە،
واز لەم خاکە بهێنن
با دڕکەکان لەجێگای خۆیان بن
گوڵەکانی لێ دەربهێنن،
ئەوەی ئەم وڵاتە پێویستی نەبێت یارمەتییە
ئێراق وڵاتی کووشتن و برینە، زەرڕەیە ژیانی تێدا نییە،

پۆستی ژمارە (236)
سێ شەممە ڕێکەوتی 15.05.2007 کاتژمێر 17:40

پێمدەڵێن: "با"ی ڕق چرۆی تەمەنی هەڵوەراندووم
لێ نازانن چەند ماندووم،
پێمدەڵێن: لە ڕۆژی دایکدا تەنیا بووم
کەچیی نازانن، من هەستێکی دەیان ساڵە کەوتووم،
پێمدەڵێن: دەرگا و پەنجەرەی ماڵم بە ڕووی خۆردا داخستووە
لێ نابینن شەمی دڵم، گوڵی تەنیایی گرتووە،
لێگەڕێن بژییم، من دەیان ساڵ لەگەڵ ئێوەدا زیندوویەکی مردوو بووم
ئازارێکی تاک و تەنها و نامۆیەکی هەمیشە غەمگین بووم،

پۆستی ژمارە (237)
چوارشەممە ڕێکەوتی 16.05.2007 کاتژمێر 16:45

خوداکان مرۆڤەکان ناچار دەکەن بۆ ئامانجێک، کە ویستی خۆیانە
مرۆڤەکان دیلی خودان، بۆ پەرستنی دەگەنە ئەوپەڕی دونیا
ڕوو دەکەنە ئەو کێوانە،
مرۆڤێک، کە پڕە لە ڕق، کۆیلەی خودایەکی تووڕەیە
مرۆڤێک، کە پڕە لە کۆیلایەتیی، ئەقڵی لە مشتی خودادایە و خۆی لێرەیە،
خودایەک سەرقاڵی گۆڕانە لە ژیاندا
خودایەکی تر تێکیدەداتەوە، شەڕ دەنێتەوە لە جیهاندا،
هەر خودایە و سووپایەک لە مرۆڤەکان بۆ خۆی چێدەکات
مرۆڤەکان هەڵدەبژێرێت بەرگی شەڕیان بە بەردا دەکات،
شەڕەکان هەمووی شەڕی خوداکانن، مرۆڤی گێل پێنازانێت
شار کاول دەبێت، گووند دەسووتێنرێت
بۆ هەر دڵۆپە خوێنێک، کە دەڕێژرێت

ئەو زێڕ و زیوو لە خوداکان وەردەگرێت،

پۆستی ژمارە (238)
پێنج شەممە ڕێکەوتی 17.05.2007 کاتژمێر 09:39

ئەم بەیانییە هیچ پۆستەچییەک لە دەرگام نادات
دەمەوێت بڕۆم، دەنگێک لە ناخمدا ڕێگام نادات،
لە پەنجەرەی ژوورەکەمەوە دەڕوانمە دەرەوە
"با" یاریی بە پەرم چەم و قژی درەختەکان دەکات
باڵندەیەک بەرەوڕووم دەفڕێت
لەم دیووی پەنجەرەکەوە بانگی دەکەم، دەنگی منی پێناگات،
دەنگێک لە ناخمدا لێرە ڕایگرتووم
ناهێڵێت بۆ هیچ شوێنێک بڕۆم
کێ ناڵێت پۆستێکی نوێی لەلای خۆی بۆ هەڵنەگرتووم؟
بەقەد شیینکایی ئاسمان دڵم پڕە لە ساماڵ
بۆ ژیانێک دەگەڕێم پڕ بێت لە ئاشتیی
بیکەم بە چرای ناو ماڵ،
کێ توانای چوونەدەرەوەی هەیە، کە درەختەکانی سەرڕێگاش دەمامکیان بەستبێت؟
کێ باوەڕی بەو وڵاتە هەیە، کە بەردەکانی سەر ڕێگا خۆیان بۆ هاویشتن ئامادە کردبێت؟
عەموودەکانی کارەباش تفەنگیان لە شان کردووە
ئێراق وڵاتێکە مەرگ ڕەشەبای تێدا هەڵکردووە،

پۆستی ژمارە (239)
هەینیی ڕێکەوتی 18.05.2007 کاتژمێر 17:56

تۆ ناتوانیت هەموو ویستەکان ڕەتبکەیتەوە
ببیتە ڕەشەبا  ئاسەواری حەزەکان بسڕیتەوە،
گەرەکمە ئێستانێ لەسەر لووتکەی بەرزی چیایەک بم
دەست درێژ بکەم بۆ هەورەکان
یان لە فڕیینی هەڵۆیەکدا چریکە بم،

پۆستی ژماره (240)
شەممە ڕێکەوتی 19.05.2007 کاتژمێر 19:30

هەموو ئێوارانێک
هەموو بەری بەیانێک،
جریوەت دەمهاژێنێ
گەروویەکی بچکۆلانەیت
کەچیی دەنگت گوێی کپی هەموو نووستوویەک بەئاگا دێنێ،
ئەی بولبولی نەشمیلانە
چ جوانیی ئەم ڕەنگەت
چ ریتمی ئەم ئاوازانە،
مەستم دەکات، مەستتر وەک لە مەستیی مەی
ئاسوودەم دەکات بە هیوای سبەی،
وردیت وەک خشڵی ژنان
سەوداسەریت وەک نەی شەوانی ئاشقان،
بخوێنە بەو دەنگە پڕ سۆزە
بۆ ئەم دڵە پڕ کروزە،
چ نەبێت تۆ هاوڕێی دڵەی بە کوڵمیت
هاوشێوەی ئاوازەکانی دڵ و هاوخەممیت،
تۆ فڕیینت بە باڵ دەپێویت نەک وەک دیل بە خەیاڵ
نۆتەیەکی ئازادیت لێت ون نەبووە وەرزەکانیساڵ،

پۆستی ژماره (241)
یەکشەممە ڕێکەوتی 20.05.2007 کاتژمێر 19:40

ئێوارانم پڕ کزەیە وەک دڵی دوعاکان
هەوارێکە پڕ چرپەی تەنیاکان،
ئێوارانم ماڵێکە لە شووشە
پەنجەی زبری بارەش ڕووشاندوویەتی
نامۆیەکە مێژووی نیشتیمانە بێ باوکەکەم هەژاندوویەتی،
دوعا بووە بە بەشێک لە ژیانم
وا لە ترپەی لێدانی دڵما

بووە بە سۆمای هەردوو چاوانم،
ئێوارانم وەرزێکی مەنگ و کەمدووە
دارستانێکە لە دڵی دوعا
برینێکی لە سەد لاوە پشکووتووە،
هەموو گیانم بۆنی دوعای لێدێت
ماڵەکەم پڕکردووە لە تابلۆی ئەو
نووکی پێم هەر بەدرێک دەپێکێت
زریکە و هاواری ئەوی لێدێت،
لەدوای مەرگی تۆوە پێم شەرمە دەست بۆ هەر بەردێک بەرم
تۆ لە بارینی بەردا هیچ چەترێکت نەبوو
هەنووکە لە شەستە و ڕەهێڵەی ئێواراندا، پێم شەرمە چەترێک ڕابگرم لەسەر سەرم،

پۆستی ژمارە (242)
دوو شەممە ڕێکەوتی 21.05.2007 کاتژمێر 10:04

هاوڕێیان با ببێت
ڕۆژێک دڵمان لەنێو مشتماندا بێت،
بوێر بین گوڵی باخی پاشا بۆ سەر مەزاری دوعاکان بدزین
چەپکێ شەوبۆ و سنبول و نازەنین
دەست بنێنە سەر دڵتان، هەموو لەگەڵما بڵێن ئامین،
وەرن با دوعایەک بۆ دوعا بکەین
چەند جوانە هەموو پێکەوە لەسەر مەزاری بێدەنگ بین
جوانترە بۆ مەرگی ئەو لەبەردەم ماڵی پاشادا وەک ئاگربین،
لەژێر ساماڵی ئاسمانێکی شیندا
لەبەردەم ماڵێکی پڕ نهێنیی و بریندا،
دەنگ هەڵبڕین، چیدی نەگرین
هەموو لەگەڵما بڵێن ئامین،
چەند جوانە ساڵانە لە حەوتی چواردا کاتژمێر یانزدە قنج بوەستین بێدەنگبین
دڵ و گیانمان لای دوعا بێت، مرۆیەکی میهرەبان بین
هەموو لەگەڵما بڵێن ئامین،
چەند جوانترە نەهێڵین کەس بکووژرێت، لە شەوی سلڤێستەردا قاقا پێبکەنین
لە شاهیی و زەماوەندی ساڵدا بۆ سەما دەستی ئەم بەردەین، دەستی ئەو بگرین
هەموو لەگەڵما بڵێن ئامین،

دەمەوبەیان دوای شەکەتبوون لە خۆشییدا
لە جەژنی نەکووژرانی ژن و لە شاهییدا،
کچان لە باخەڵی کوڕاندا لە شیریینی خەوا
خەو بە دوعاوە ببینن، زامەکانی ڕامووسن
بە تەنها بێن بۆ بەعشیقە، بە کۆمەڵ پێیبڵێن: ماڵئاوا،

پۆستی (243)
سێ شەممە ڕێکەوتی 22.05.2007 کاتژمێر 09:03

چیی یارمەتیی مرۆیەکی دیل دەدات؟
مرۆیەکی دیل لە قەفەزێکی تەنگدا بە ئاستەم هەناسە دەدات،
لە قەفەزێکی تەنگدا گیرە
مرۆڤێکی دیل هەناسەی وەک ڕۆیشتنی پیاوێکی پیرە،
لەوێدا بەتەنها قەفەزەکەی تەنگ نییە
ڕۆحیشی تەنگ بووە
مرۆڤێکە دوای پارەکەوتووە
پارە لە قەفەزێکی تەنگدایە بۆیە ئەو هێلانەی خۆی تێدا چێکردووە،
دەستەڵات پارە فڕێدەداتە قەفەزەوە
تەماشای ئەم هەموو مرۆڤە، وەک ڕیشۆڵەی بە تۆڕ گیراو
جێگای خۆیانی تێدا دەکەنەوە،

پۆستی ژمارە (244)
چوارشەممە ڕێکەوتی 23.05.2007 کاتژمێر 12:24

سپیی سپیی وەک کلووی بەفر
پەڵەیەک خوێنی مەیوو بە گەردنتەوە، پرچ ئاڵۆزکاو
بەبێ کفن بەبێ قەبر،
شەوبۆی دەستەخوشکی دوعای گوڵ
بکووژی هەردووکتان پیاوە
ناختان پڕە لە ژان، دەروونتان لە ڕق و کینە خاڵیی
جەستەی هەردووکتان بە سمی تێهەڵدان کووتراوە،

ئەم هەوارە پەستم دەکات
دیمەنی ئەم شەوبۆ ژاکاوە وڕ و کاسم دەکات،
چەندەمیین شەوبۆی ئەم نیشتیمانە بێ باوکەیت؟
چەند شەوبۆی تر دەناسیت؟ وا لە شاهیی مەرگی خۆتدا سەرچۆپیی بە کەس نادەیت،
نیشتیمانی ئێوە بەعشیقەیە
ئەو ژنەی بەم ئاگرەدا تێدەپەڕێت کارامەیە،
پیاوان بۆ کووشتنی ژنان لیستیان پێیە
نازانم باوانم، هۆی مەرگی تۆ ژمارەی تێلێفۆنە یان نامەیە؟
بڕۆ بۆ لای دوعای گوڵ
ئەی گوڵی سپیی ژاکاو
لە بەعشیقە ماڵێ بۆ ژنان چێبکەن لە خشڵی دڵ،

پۆستی ژمارە (245)
پێنج شەممە ڕێکەوتی 24.05.2007 کاتژمێر 08:30

لە تەمومژدا مرۆڤ هەر تیرێک دەهاوێت
بێ تاوانێک دەپێکێت
لە تاریکییدا مرۆڤ چەقۆ بۆ هەرشتێک دادەنەوێنێت
دەرئەنجام بێ تاوانێک دەکووژێت،
لە تەمومژ و تاریکییدا، کە چرا نەما
دواکات دەبێت بەرگی دیلیی بکەین بە بەردا،

پۆستی ژمارە (246)
هەینیی ڕێکەوتی 25.05.2007 کاتژمێر 09:20

ئێوەی ژن باڵندەگەلێکی دیلن
وەک چۆن ئەوان فڕینیان بە خەیاڵ دەپێون
ئێوەش ئازادیی بە چاوی خەیاڵ دەبینن،
ڕابە ئەی ژن مێژووی ئازادییت بنووسەوە
ڕەگی مێژوو لە هەنگاودایە نەک لە ڕابووردودا
ئەو هەنگاوەی دەینێیت بۆ ئایندە خۆی مێژووە،
تۆ ئەگەر ئێستا هەنگاو لە مێژوودا نەنێیت

ئایندەشت جیهانێکی پڕ کێرد و چەقۆی ڕابردووە،
کات خڕ دەڕوات ئەی ژن، باوانم
ئەی هەناسەی تەپڵی دڕاوی دڵ، ئەی تابلۆی شێواوی چاوانم،
تۆ دەبێت وەک جوتیارێکی کێڵگەکانی مێژوو، خاکی دەستەڵاتی پیاو هەڵدڕیت
بست بە بست بە بێڵی دەستەڵات شەتڵی هێزی ژن بچێنیت،
ڕابە بۆ گەیشتن بەم ئامانجە
ئەو پیاوەی هاتە سەرِ ڕێگات، دڵنیابە پیاوێکی بکووژە
ژنێکی دلێربە، ڕێی ئازادیی ڕێگایەکی سەخت و گرژە،

پۆستی ژمارە (247)
شەممە ڕێکەوتی 26.05.2007 کاتژمێر 12:45

سەردەمێکە ئازاری ژن وەک تەوق کراوەتە ملم
لەبەردەم ئەم هەموو تابلۆی خوێنانەدا
مرۆڤێکی داچڵەکیوو و سڕم،
غەدر ڕایچڵەکاندووم
فرێدانی بەرد وڕ و کاسی کردووم،
چەقۆ و کێرد و گوللەی پیاوانی پووت
ژیانیان لێ تاڵ کردووم،
نیشتیمانم قەسابخانەی ژنانە
کولانەی دز و جەردە
هەواری ژن کووژانە،

پۆستی ژمارە (248)
یەکشەممە ڕێکەوتی 27.05.2007 کاتژمێر 08:30

نەرم نەرم بمگرە باوەش
بمنووسێنە بە خۆتەوە بە پشکۆی ئەشقێکەوە
نیگام بکە بە هەست بە ڕۆح بە دوو چاوی ڕەش،
تووڕەبوون لێت پاییزێکە پڕ لە خەزان
نووستن شەوێک بەبێ تۆ جیهانێکە بێ ناونیشان،
وەرە نزیکبە لێم
بمدوێنە، بە زیبزیی تۆ، من مرۆیەکی بێ جێگا و ڕێم،

پۆستی ژماره (249)
دوو شەممە ڕێکەوتی 28.05.2007 کاتژمێر 13:21

کە ئەم ژیانە دەخوێنمەوە
دەبمە هەشتا و هەشت دووگمەی ڕەش و سپیی
بە نۆتەی کزە درێژی دڵ، ئەم ئازارەم دەنووسمەوە،
خەمبارم، تەزیین میوانی لێوەکانمە
شاعیرێکی تەنیا و زیزم، مۆسیقا ئاوی ژیین و گیانمە،
مەکربازن ئەو ژنانەی بەدەمتەوە پێدەکەنن
ئامان نەکەی گوڵی سڵاویکیان تێبگریت
دەنا سەراپای ژیانت پڕ دەبێت لە خەم
چرای ماڵت کز دەسووتێت
سەراپا تەمەنت دادەپۆشرێت بە تەم،
تۆ ئەی مۆسیقاژەنی درەنگ وەختی سەر ڕێگا
نۆتەکانت پێناسی پەنجەرەی پڕ سەهۆڵی یادەوەرییەکانی من دەکات
دەڵێی ئەو هەستانەت
سەری پەنجەی مەلەکێکە و یاریی بە پرچی ئاڵۆزی ئەشکم دەکات،
ئەو هەستانەت دەڵێی منداڵێکی لاسارە و لە ئەڵقە فڕێدراوەکەی پەنجەم دەڕوانێت
دەڵێی شەمی غوربەتە و لە ئێوارەیەکی پڕ کزەدا
پێرو پێرو لە ئامێزی خۆیم دەنێت،
خۆزیا منیش کچەکەی پەیکەری شەو دەبووم
خۆزیا منیش تەنها جارێک لە ژیاندا بەختەوەر دەبووم،
ئەم "با"ی خەمە لەگەڵ خۆیدا هەڵمدەگرێت
تۆ تەماشا ڕۆژ نییە تاوە تەرزەی خەمی ژنێک وەک ملوانکە لەملمان نەکرێت،
ڕۆژی کووشتنی هەستەکانە باوانم
زوو بێرەوە وا بە پەنجەی ڕق دەریان هێنا گلێنەکانی هەرتک چاوانم،

پۆستی ژماره (250)
سێ شەممە ڕێکەوتی 29.05.2007 کاتژمێر 15:45

خۆشمان دەویێ بەقەد چاومان
تۆ گلێنەی گوێچکەی مۆسیقامانیت
گەورەیت وەکوو ژیان،
لە جیهانی مۆسیقای بێ تۆدا
هەریەکەمان ڕێبوارێکین بێ نیشتیمان،
ئەمێستاش، کە دەرگای نیشتیمان بە ڕووماندا داخراوە
نامۆیەکین بێ ناونیشان،
پۆستی ژمارە (251)
چوارشەممە ڕێکەوتی 30.05.2007 کاتژمێر 16:30

کابان تۆ دەریایەک لە وشەیت،
ئاسمانێک لە شنەیت
لە سەمای ئاوازدا تۆ جریوەیت،
لە کۆڵانەکانی سەردەما دەنگی تۆ چرای هەڵواسراوی ماڵانە
بە دەنگی پڕ سۆزی تۆ دایکێکی بەختەوەر و خان و مانە ئەم نیشتیمانە،
ئەوەڵ سەحەرە و تەنها یەکتریی شک ئەبەین
پشتمان ناوە بە پشتی یەکەوە، تەماشای چاوی گەشی خۆر دەکەین،
ئەوەڵ سەحەرە و بە تەنیا دوو پشکۆی ئاواز و گۆرانیی شک ئەبەین
لەبەردەم ژیلەمۆی بەیانێکدا سلاو لە دەنگی کابان دەکەین،

پۆستی ژمارە (252)
پێنج شەممە ڕێکەوتی 31.05.2007 کاتژمێر 11:24

ئامینەی دوانزدە ساڵ
لە شەلاڵی خوێنی خۆیدا بووە بە چرای داگیرساوی ماڵ،
بەرلە مەرگی، بە گریانەوە بە باوکی گووت: گوێ ڕادێرە
ئەم مۆسیقایە پێتدەڵێ: کێ هەڕەشەمان لێدەکات
چەقۆی غەدری کلتوور، شمشێری شوومی ئایین لەت لەتمان دەکات،
بابە گۆرانیی بۆ کووشتنی من مەڵێ
منداڵێکم دوانزدە ساڵ، لە ترساندا دانەچۆقەم دێ،
کووشتنی من ئاسوودەت ناکات
سوورکردنی دەستت بە خوێنی من تاوانبارت دەکات،

دالّەکەرخۆرەکان بەربوونەتە گیانی کۆترەکان بە ئاسمانەوە
قیرەیان دێت، دەیانەوێت فڕیین لەبیر کۆترەکان بەرنەوە،
منی کۆتر دوانزە ساڵێکی باڵنەگرتووم
بە گریانەوە لەژێر پێڵاوەکانی باوکمدا کەوتووم،
مەمکووژە بابەی تووڕەم
کیژێکی منداڵ و پڕ ئاواتم
نامەوێت بمرم، وەک ڕووبارێک بۆ ژیان پڕ خوڕەم،
پۆستی ژمارە (253)
هەینیی ڕێکەوتی 01.06.2007 کاتژمێر 11:58

یەکەم گریەی من لە لەدایکبووندا
بۆ ئەم ئازارە چاوەڕوانکراوە بوو
یەکەم وشە، کە خووم پێوەگرت
ئازادیی بوو
یەکەم کەس، کە ڕقم لێ هەڵگرت
مامۆستاکەم بوو،
یەکەم تف دایکم لێی کردم
دووهەم برا
من یەکپارچە بەستەڵەک بووم
ساڵ لە دوای ساڵ تەمەنم
بە ئاگری غەدر ئەبرژا،
دەستەڵاتێکی زاڵ تەزاندمی
خێزانێک بە پەروەردەکردنێکی نادروست
وەکوو پاییز وەراندمی،
پۆلیسێک ئەتتۆقێنێ
مامۆستایەک ڕۆژی "دە"جار ئەتشکێنێ،
باوک، برای گەورە
بۆ پەروەردە تێتهەڵدەدەن
دایکێک بە زللە و جنێو ئەتخەوێنێ،
ئەمە نیشتیمانی منە
مرۆڤێکم وێڵی ژیان
ڕۆحێکی وێران پێناسی منە،
سیاسەت شەکەتمان دەکات
خاڵیی لە خۆشەویستیی

بە ڕق و کینە جامی ژیانمان تاڵ دەکات،
تاڵ وەک قاقاکانی پیاوێکی جەللاد
وەک چکلێتەکانیماڵێکی چرووک
بۆ منداڵانی شەوی بەرات،
دەستەڵاتی زاڵ تووڕەمان دەکات
ئەوکاتانەی ئازادییمان بە کۆت و زنجیر
زمانمان بە شیشی هەڕەشە
برسێتییمان بە خوێن داغ دەکات،
دەگەڕێم بەدوای ژیان دا
جیهانێک لە خۆشەویستیی
کۆمەڵگایەک یەکپارچە لە مرۆڤایەتیی،
شەڕ دوژمنم تۆی
ڕێ ونکەری ئازادییم تۆی
لەم وڵاتە وا مەرگ سێبەری باڵامانە
هاوار ژیان تۆ لەکوێی؟

پۆستی ژمارە (254)
شەممە ڕێکەوتی 02.06.2007 کاتژمێر 09:20

بەم هەموو بریینە مۆرانەی ڕۆحمەوە بۆ کوێ بچم؟
بەدەر لە بەرۆکی تەنیایی لەدەستم دێت ئێخەی کێ بگرم؟
ئەژنۆکانم هاوڕێی گیانیی ژیانمن
لەوەتەی هەن دەیانکەمە باوەشم
کەس لە خەمی مندا لێرە نییە
سروشتی خۆم وەهایە، مرۆیەکی چارە ڕەشم،

پۆستی ژمارە (255)
یەکشەممە ڕێکەوتی 03.06.2007 کاتژمێر 11:49

دەمەوێت زانا بم، چونکە حەزم لێیە*

نەک دوای بانگێکی نامۆ بکەوم
من خودام خۆشدەویست، چونکە خودا جیهانی
هەتا بکرێت بێ ئەقڵانە دروستکردووە،
ئەگەر منیش هێڵەکەم بەم خواروخێچییە بڕوات
ئەوا زانایی لەوێوە ڕێچکەی گرتووە،
بووکەسەماکەرەش لێرەدا کۆتایی هات، *
هەنووکە منیش بڕیار دەدەم
منیش لەسەر تەوقی سەری وشەکانم ئاڵای یاخییبوون هەڵدەکەم،
یاخییم لە هەموو شتتان
لە ڕووخسار و دەنگی پێ و لە گووتەتان،
دەستەڵاتێکن نقوومی تاوان
لەمپەڕی گێلتانەوە هەتا گەورە زاناکان،
کۆمەڵێکن هەتا بۆتانکرا دەستەڵاتێکتان بەبێ ئەقڵترین شێوە دروستکرد
دزتان هێنا و دەستێ چاکەت و پانتۆڵتان لەبەرکرد،
جەللادتان هێنا و فێری خوێندنەوەی شیعرتان کرد،
ئەو بانگەی ئێوە دەیدەن نامۆیە لام
دوای ناکەوم، چونکە زانام،
لێرەوە تەماشای بووکە سەماکەرەکانتان دەکەم
شەوان پێش خەوتنیان دۆلارەکانیان دەژمێرن
منیش بەرەو کار پێلاوەکانم لەپێ دەکەم،
بەیانییان پێش نانخواردن زەوییەکانیان دەپێون
لێرە کۆمەڵێک کرێکاری شەو دەبینم، بێ نانخواردن دەچنە جێگاکانیان دەخەون،
ئێوە بووکە سەماکەرانی دەستەڵات، لەوەتەی هەن هەنگاوتان خواروخێچە
چونکە ناختان کۆیلەی پیاوی هیچە،

* هۆنراوەی " بڕیاردان"ی فریدریش نیچە لاپەڕە 44
Gedichte: Friedrich Nietzsche

پۆستی ژمارە (256)
دووشەممە ڕێکەوتی 04.06.2007 کاتژمێر 09:17

لە شەتە گەورەکانەوە، من گەورە دەبینم*
دەبێت مرۆڤ بێدەنگ بێت؟
یاخوود قسەی گەورە بکات؟
قسەی گەورە بکە ئەی زانایی سەرسووڕهێنەرم، *
قسەی گەورە دەکەیت وەکوو زانا
بێدەنگ نەبوویت، ئەو ساتانەی گابەردێکیان لەسەر سنگی دەنگ دانا،
تۆ دەتویست هەموو شتێک دەنگی هەبێت
زانایەکی سپیی بوویت، دەبوو هەموو دەنگێک لەلای تۆ ڕەنگی هەبێت،
دەنگ پێویستە بۆ شەقام
دەنگ دەبێتە نان، دەبێتە مەرهەمی ئێش و زام،
ڕەنگی نەماوە ڕووخسارم، برینێکی هەلاهەلام
ئەی ڕەنگی وڵاتی گڕ و خوێنم وەرە لام،
وەرە لام تێرمبکە لە بۆنی خاک
من تۆم هەبێت بە دەنگمەوە لە هیچ شتێک نیمە باک،
لە ڕووداوە گەورەکانەوە گەورانە ببینن
بێدەنگ مەبن، بدوێن، زانا بن
ئێوە هەموو پێکەوە ئازاری یەک تاکە برینن،

* کۆپلەیەکە لە هۆنراوەی " سکاڵای ئاریادنە"ی فریدریش نیچە لاپەڕە 100
Gedichte: Friedrich Nietzsche

پۆستی ژمارە (257)
سێ شەممە ڕێکەوتی 05.06.2007 کاتژمێر 12:00

هەست بە ئارامیی دەکەم
کرێکارێکم نیشتیمانم نییە
ئەو جێگایەماڵی منە، کە کاری لێدەکەم،
مرۆیەکم بە دەستی زێدەباییەوە دەناڵێم
بە سنوورەکاندا دەڕۆم
دەگەڕێم بۆ ئەو نیشتیمانەی دەبێتە چرای سەر ڕێم،
کرێکاران نیشتیمانیان نییە

ئەوەی من بەدوایدا ویڵم ژیانێکی یەکسانییە،
دادپەروەرییم دەوێت لە هەرکوێ بم
دەمەوێت لەم ڕێگایەدا بڕیاردەری مەرگێکی جوان بم،

پۆستی ژمارە (258)
چوار شەممە ڕێکەوتی 06.06.2007 کاتژمێر 07:30

وەک مۆنالیزا خۆت  مەنوێنە
بێتاوان نیت، دڵڕەقێکیت بێ وێنە،
تۆ مۆنالیزا نیت، چیرۆکێکیت باجی شەڕانگێزیی خۆت دەدەیت
تیغێکی شاراوەیت
بۆ شکاندنی دڵان خەنجەرێکی هەمیشە ئامادەیت،
چەند بە مەکر لە وێنەدا وادەرکەویت
هێشتا لەبەردەم بچووکترین ڕاستییدا نەوییت،

پۆستی ژمارە (259)
پێنج شەممە ڕێکەوتی 07.06.2007 کاتژمێر 14:30

ئەم گەردوونە پێویستی بە خودایەکی ژنە
ئەم جیهانە بەدەست پیاوەوە ژنێکی هەتککراو و ناو ونە،
ئێوە ئەی ژنانی نۆکەرانی پیاو
لەوەتەی هەن ڕێگری ئازادیین
ڕقتان دەبێتەوە لە ساماڵی ئەویین
لە مژدەی خۆرەتاو،
دە جەنگن دژ بە ژن دژ بە ماف
بۆ هەڵخستنی کچانی خۆتان، ئەگریجە و پرچتان دەکەن بە تەناف،

پۆستی ژمارە (260)
هەینیی ڕێکەوتی 08.06.2007 کاتژمێر 16:36

خودایەک ژیان کاول دەکات

خودایەکی دی دروستی دەکاتەوە،
خودایەک کۆشکێک بۆ دادپەروەریی چێدەکات
خودایەکی تر تێکی دەداتەوە،
خوداکان خێزانێکن دانوویان لەگەڵ یەکدا ناگوونجێت
ئەوەی ئەمیان خۆشی دەوێت
ئەوی تریان ژیانی لێدەستێنێتەوە،
مرۆڤ دەنکە گەنمی هاڕدراوی نێو دەستاڕی شەڕی خوداکانە
کەچیی لەوەتەی هەیە هیچ کارێکی نییە، بەدەر لە ملکەچیی و پاکانە،

پۆستی ژمارە (261)
شەممە ڕێکەوتی 09.06.2007 کاتژمێر 22:31

چەندم خۆش دەوێیت ئەو دەمەی ژێرکراسێکی نارنجیی لەبەردەکەیت
بە ئەشقەوە چاوەڕوانم لێوی سووری کەلەپۆ ماچ بکەیت،
دڵنیام ئەو خودایەی تۆی دروستکردووە ژن بووە
هەستێکی گوڵەباخیی سەراپای گیانی ڕازاوەی ڕەنگی تۆ بووە،
ئەی خۆر
ئەی گوڵی گەورەی ژیان، گەشاوە بە دەیانجۆر،
بە هەڵهاتنت بەختەوەرم
بە تەماشاکردنت مرۆڤێکی ئاسوودە و پڕ سەفەرم،

پۆستی ژمارە (262)
یەکشەممە ڕێکەوتی 10.06.2007 کاتژمێر 10:45

ئاوازێ شکنابەم تینوێتیی ڕۆحم بشکێنێت
نامۆیەکی نقوومی ئەم خەمەم
نۆتەیەک شکنابەم دەرمبهێنێت،
موسیک کاری بێ بەهران نییە
ئەم وڵاتە پڕی ڕیتمی شکاوە
شانۆکان هەناسەیان تێدا نییە،
لەنێوانی وتە و نۆتەدا گوێگرێکی ونم
مرۆیەکی بێ ناوی دڵشکاوم

نە هێرۆی دەرکی حەوشە نە شەونمم،
ئۆپێرایەکم دەوێت سەراپای گیانم بلەرزێنێت
بۆ مۆسیقارێک دەگەڕێم سروشت لە نۆتەیدا بڕوێنێت،

پۆستی ژمارە (263)
دوو شەممە ڕێکەوتی 11.06.2007 کاتژمێر 17:39

بە بەرچاوی خۆمانەوە هەتکتدەکەن، نقەمان لێوە نایەت ئەی نیشتیمان
دیسان ئاگر لە جەستەت بەردەدەن، کەسێک نییە بتپارێزێت ئەی کوردستان،
تۆ ، کە هێشتا سەراپای گیانت شەلاڵی خوێنی غەدری مێژووە
بەرگەی ئەم هەموو برینە نوێیە ناگریت
نیشتیمان تۆی تاکە دەست، کام غەدر ما سەنگەری لێنەگریت؟
نیشتیمان ئەگەر ئەم سووپای غەدرە شیعر بوایە لە مێژ بوو ڕووخاندبووم
ئەگەر ڕۆمان بوایە، منی ئاگر لە مێژوو بوو سووتاندبووم،
من کوڕی وشەم، دژی شەڕم
لێ نیشتیمانە شیرینەکەم، کە دوژمن ئاگر لە سینەت بەردات
دەمەوێت بە دەستی خۆم ورگی هەڵدڕم،

پۆستی ژمارە (264)
سێ شەممە ڕێکەوتی 12.06.2007 کاتژمێر 22:20

تەنها پیاوێکی مردوو باشترین پیاوە
هێند زووخاوی کووشتنی ژنان چووەتە دڵمەوە
چەپ و ڕاستی خۆم، ڕەش و سپیی
تاریکیی و خۆرەتاو ناناسمەوە،
شەرم دەکەم لە پیاوبوونی خۆم
مرۆڤێکم بەم ڕۆژگارە ناسۆری کووشتنی ژنان دەخۆم،

پۆستی ژمارە (265)
چوارشەممە ڕێکەوتی 13.06.2007 کاتژمێر 20:42

هەندێکجار هەستێک وەک شەختەی ساڵ دەمتەزێنێت

هەستێک وەک ڕەشەبا، منی درەختی ڕووتەڵە هەڵدەکەنێت،
هەستدەکەم تەنیاترین مرۆڤی دونیا منم
شاعیرێکی پەڕاگەندە و نامۆیەکی شەرمنم،
نامۆترین نامۆی ناو نامۆکانم
یاخییەکی سەرەڕۆ و ڕێگایەکی سەختی ناو تابلۆکانم،
بیرکردنەوەم لە کەس ناچێت
مرۆیەکی تەنیا ڕێم، نیگای هەموو شتێکم پێناکرێت،

پۆستی ژمارە (266)
پێنج شەممە ڕێکەوتی 14.06.2007 کاتژمێر 18:09

کێ دەڵێت ئێمەی مرۆڤی مۆدێرن لە هی پێشتر باشترین؟
هارمۆنییتر و مرۆڤدۆستترین،
بە سەلیقە و ئاقڵترین،
ئێمە لە مرۆڤی سەدەکانی ناوەڕاست خراپترین، لێ هەستیپێناکەین
بەربەریست و تۆقێنەرترین
ڕێنیشاندەری کووشتن و بڕینین
تاکپەرست و دیکتاتۆرین، ڕێگای ڕاستیی وندەکەین،

پۆستی ژمارە (267)
هەینیی ڕێکەوتی 15.06.2007 کاتژمێر 02:33

شەو درەنگە بە ڕێگاوەم، ڕێگای ماف
ویستمە بگەم بە ئازادیی، بێباکم لەوەی ملیشم بدەن لە تەناف،
لەم تارییکستانەدا، گوێم لە دەیان دەنگی دڕە
دەستەڵات لەم جیهانەدا تابلۆیەکی زبر و شڕە،
دەستم بەر هەشتێک دەکەوێت، ڕووی دەستەڵاتە
دەستم بەر هەر تەنێک دەکەوێت، پڕ لە مێژووی کارەساتە،
هاتووم لەم ئەنگووستەچاوەدا چرایەک هەڵبکەم
هاتووم پەردە لەسەر ڕووی ڕاستەقینەت لابدەم،

شەو درەنگە بە ڕێگاوەم
مرۆڤێکی شەکەت و بە ئازار شۆراوەم،
ئازاری قیژەکانی نیشتیمان
ئازاری تەشەناکانی* ژیان،
نەهاتووم جنێوت پێبدەم
هاتووم سەراپای تاریکییت بە چرا هەڵبکەم،
ئەی دەستەڵات
ئەو ڕۆژەی ئێمە بۆ دەنگ دەگەڕاین
تاریکیی کووشتبوونی، لەبەر خۆرەتاودا بۆی دەگریاین،
هەنووکە تۆ خۆت بکووژی خۆر و دەنگیت
پێویستمان پێت نییە تنۆکی چۆڕیووی سەر ڕوومان بسڕیت،

* تەشەنا: کێم.

پۆستی ژمارە (268)
شەممە ڕێکەوتی 16.06.2007 کاتژمێر 11:45

وێنەیەک بە وشە دەکێشم
من ناسێنەری هیچ شتێک نیم
ڕەنگی بینای شیعرم بە وشە دەڕێژم،
ڕابەرایەتیی جانتا ناکەین ئێمە*
ئەوەی ئێمە ڕابەرایەتیی دەکەین لە دوو جانتا زیاتر نییە
وەک ناسراوە لای شاعیران، هەڵگرتنیشیان قورس نییە،* (284)
جانتاکانی دەستی من، جانتای ڕاستیی و ئازادییە
لە ئاگردا دەژییم، بە شەختەدا تێدەپەڕم
باکم قەت لە مردن نییە،

Friedrich Von Schiller: Gedichte und Balladen. Seite 284 Xenien.

پۆستی ژمارە (269)
یەکشەممە ڕێکەوتی 17.06.2007 کاتژمێر 14:44

هەرکات خۆر بڕیاریدا چیدی هەڵنەیەت
منیش بڕیاردەدەم چیدی خۆشەویستیی نەکەم
دەبمە بەردی گەوەی شاخ
مەرجە گوڵێک چییە بۆنی نەکەم،
هەرکات مانگ بڕیاریدا چیدی لە باوەشی دەریادا نەخەوێت
منیش بڕیار دەدەم نیگای ژنێک چییە نەیکەم
دەبمە خاک و خۆڵ بێهەستیی هەرچیی بوونە بۆ خۆم دەیبەم،

پۆستی ژمارە (270)
دوو شەممە ڕێکەوتی 18.06.2007 کاتژمێر08:11

دەتکەم بە قردێلەی پرچی هۆنراوەیەک
جێگا نەما بۆت نەگەڕێم، کەس نەما لێی نەپرسم بۆ سۆراغی چارەیەک،
تۆ ئایندەی ئەم خاکە زامدارەی
بۆ ئێمەی کوێر، تۆ چاومانی
بۆ ئێمەی مردوو، تۆ ژیانی،
بەبێ تۆ ئێمە کۆیلەین، هەڵەکان دەناسێنین بە ڕاستیی
ئەی هیوای من، ئەی ئازادیی،

پۆستی ژمارە (271)
سێ شەممە ڕێکەوتی 19.06.2007 کاتژمێر 09:26

مرۆڤ هەموو تەمەنی دەگەڕێت بە دوای خۆشەویستیی دا
بێسانەوە دەبێتە دێوانەیەکی کاروان و ڕێگا،
ئەشق بازنەیەکی داخراو نییە بۆ ناپاکیی نەکردن
ئەشق لە توێی ئەڵقەیەدا دیل ناکرێت بۆ ناو پەنجەی باریک یان درێژ یان خرپن،
ناپاکییە ئەگەر ئەشق هاتە سەر ڕێگات و تۆش ڕووی تێنەکەیت
پابەند بیت بە یاسای بازنەوە، گوڵێک چییە دیاریی ئەشقی نەکەیت،
ناپاکییە ئەشق نەکەیت
لەکاتێکدا لە ماڵەوە پەی بە تۆزقاڵەزەڕڕەیەک هەست چییە نەبەیت،
ئەشق "با"یە بەندکردنی بۆ نییە
ئەو کەسەی بەدوای خۆشەویستییدا ناگەڕێت

بەندی یاسای بازنەیە، مرۆڤێکی کەوییە،
مرۆڤ تۆ لە ماڵەوە بەندی دەستووریت، ئەشق دەمێکە لە ماڵتا نەماوە
ناپاکیی دەکەیت لە ئەشق، کە پێی ڕۆیشتنت شکاوە،
ئەشق مەلێکی بەرزە فڕە لقی نزمی درەخت ناناسێت
هەست "با"یەکی تینووە جێگاپێی ئەشق هەڵدەگرێت،
ناپاکن ئەوانەی بەبێ ئەشق لە ماڵێکدا دەژیین
ڕۆژانەیان پڕ ژان و خەمە، بە کوڵ بۆ نەبوونی ئەشق دەگریین،

پۆستی ژمارە (272)
چوارشەممە ڕێکەوتی 20.06.2007 کاتژمێر 12:45

سەری بڵندم تەنها بۆ تۆ نەوی دەکەم نیشتیمان
گیانم تەنها بۆ تۆ بەخت دەکەم نیشتیمان،
گەورەم نییە لە تۆ زیاتر
هیچ باوەڕێک لە ڕووی خاکیی تۆ بە پاکتر نازانم جارێکیتر،
تۆ لە سەرووی هەموو باوەڕەکانەوەیت
لە تارییکترین ڕۆژگاری ژییندا، بەتەنها تۆ ئەستێرەیەکی گەشاوەیت،
شەڕە لەسەر باوەڕ و ئایین، شەڕە لەسەر گەش و هەوا
ئەو کوردەی شەڕ لەسەر پاراستنی تۆ نەکات ئایین و باوەڕی کوا؟

پۆستی ژمارە (273)
پێنج شەممە ڕێکەوتی 21.06.2007 کاتژمێر 13:36

دەزانم ڕۆژێک دادێت ئێمەی ژێردەست دەبێت وەک ڕەشەبا هەڵبکەین
کاتێک دێت پێویستە لە تارییکترین ڕۆژگاری مێژوودا کڵپەیەک هەڵبکەین،
ڕۆژێک لە شوێنێک پێویستە ڕووداوێک ڕووبدات
لێ نازانم کەی
تۆ، کە بە ئاگرێکەوە ڕاوەستاویت، نازانم کەنگێ پێویستە چرایەک هەڵبکەی،
هەموو شت لە کات و شوێنی خۆیدا
ئەمە یاسای سروشتە، ڕێی هەموومانە پێویستە بڕۆین پێیدا،

پۆستی ژمارە (274)

هەینیی ڕێکەوتی 22.06.2007 کاتژمێر 11:45

ئەو پۆستاڵەی دوێنێ لەسەر تەوقی سەرم ڕاوەستا بوو
هەنووکە بوەتە کڵاش
هەموو لێم بوونەتە جەللاد نووسەر و پۆلیس و دارتاش،
من لەوێرا خۆم بە ئازاد دەزانم، کە ئازاد بدوێم
مرۆڤێکی دیلم ئەگەر بێتو لەودیووی ڕاستییەکانەوە گۆرانیی بۆ هەق بڵێم،
هەقی من لەوێدایە، کە بیستێنم
ئازادیی من لەوێدایە ئەو چقڵەی لە چاوی ڕاستیی چەقێنراوە دەریبهێنم،
زاڵبوون ناسیۆناڵیتێتیی نییە
بە هەر پەیڤێک بدوێت ئەو هەستی مرۆڤایەتیی نییە،
وتاری ئەوە شەق و تێهەڵدان و کووشتن
ئەو کۆرپانەی ڕزگارکەری ئازادیی بوون، ئەو بەرلە لەدایکبوونیان لەناوی بردن،

پۆستی ژمارە (275)
شەممە ڕێکەوتی 23.06.2007 کاتژمێر 14:35

من هێند بەهێزم، توانای هەڵگرتنی خەمی خەڵکیم هەیە
هێند باوەڕم بە ئازادییە لەم تاریکستانەدا چرای سەر ڕێگای خۆمم هەیە،
بە هەق دەدوێم
نامۆیەکم هەمیشە سروود بۆ ئازادیی دەڵێم،
باوەڕم بە ڕزگاربوونتە
چونکە ئازادیی هەناسەی درێژی ژیانتە،
تۆ بە تەنها دراوسێکان دوژمنت نین، چقڵت لە بەژنی خۆشت هەیە
ئازارێکیت ڕەگت لە مێژوودایە
ئەوانەی بە ئازادییت پێدەکەنن بەرگی تۆیان لەبەردایە،
من چونکە خۆشمدەوێیت ئازادییت لام مەحاڵ نییە
خەو بە ئازادییتەوە دەبینم
ئاخر لەنێوانی خەون و خۆشەویستییدا سنوور نییە،

پۆستی ژمارە (276)
یەکشەممە ڕێکەوتی 24.06.2007 کاتژمێر 12:34

هیچ شتێک بە قەد وشە تۆ جوان ناکات ئەی مۆسیقا
ئەو کەسەی پۆشاکی وشەت بۆ ڕێکنەخات، ناپاکیی لە تۆ و لە واتاش دەکا،
ئەو وشەیە جوانە، کە باس لە ڕاستیی دەکات
ئەو مۆسیقایە جاویدە، کە سروشت تێکەڵ بە گێڕانەوەی ڕاستیی دەکات،
ئەو مۆسیقارە گەورەیە وشە و موسیک لێک مارە دەکات
نەزانە ئەو کەسەی باوەڕ بە خۆشەویستیی موسیک و واتا نەکات،

پۆستی ژمارە (277)
دوو شەممە ڕێکەوتی 25.06.2007 کاتژمێر 20:16

هەموو ئەو جارانەی بیر لە مردن دەکەمەوە یەک وێنەم هەیە بۆ خۆکووشتن
وێنەیەکی ڕەنگاو ڕەنگ لە واتاکانی مردن
دوای چرکەکانی دەکەوم بەبێ ڕاگرتن،
میلی کاتژمێری مردن لەلای من هەمیشە وا دەڕوات
قەقنەسێکە هەواڵی من بۆ ئەودیوو کیشوەرەکانی ژیان دەبات،
مردن ئاشقی کووژانەوەی ژیانی منە
ئەو بەبێ من ساتێک چییە هەڵناکات،
مردن دڵناسکترین خۆشەویستی منە
هەموو ئەو دەمانەی جێیدەهێڵم، پاییزێکە پڕ پەڵە
تەواوی باریینی بۆ نامۆیی ژیانی منە،
خەمۆکیی من بێدەستەڵاتیی نییە بەڵکوو ژیرییە
بێزارم لە ژیانێکی بێ واتا
بوونم شەلاڵی نامۆییە،
نامۆم بەو هەناسەیەش، کە هەڵیدەمژم
زەمینێکی پان و بەرین بۆ من چەند کۆڵانێکی تەسکە
ژاڵەی تەنیایی خۆمی تیادەکرۆژم،

پۆستی ژمارە (278)
سێ شەممە ڕێکەوتی 26.06.2007 کاتژمێر 21:12

تاکە کار و گەورەترین کاری من ئەوەیە بەختەوەر بژییم
لەوەتەی هەم ئەسووتێنرێم
تۆی زاڵ برینێکم چییە بۆت نەسڕییم،
لەو ڕۆژەوە تۆ ئازادییت لێ زەوتکردووم
بۆ مانەوەی خۆم بەپێوە دەربەدەر بووم،
تۆ بە ناوی ڕزگارییەوە وەک دوژمنان هەتککردم
خۆم کەرتێک لە خاکێکی کەرت کەرتکراو بووم
کە تۆ هاتیت دوو جاری تر کەرتتکردم،
من ئازادییم دەوێ
برینێکم لەوەتەی هەم خوێن لەبەر گەرووم دەچۆڕێ،
خشتێکم بەدەستەوەیە، دەیکەمە بەردی بناغەی ماڵی ئازادیی
سەرو خشت بگرن بەدەستتانەوە، لەگەڵما ئەم ماڵە دروستبکەن
ژیانێک بژیین پڕ سەروەریی،
ئازادیی ئەرکی هەمووانە نەک هی تاک
ئەو کەسەی خشتێک لە ماڵی ئازادیی دا دانەنێت
زۆرداردۆستە، مرۆڤێکە بەرانبەر ژیان ناپاک،

پۆستی ژمارە (279)
چوارشەممە ڕێکەوتی 27.06.2007 کاتژمێر

لەوەتەی بۆنی دەریام کردووە
حەز لە مردن زیاتر دەکەم
نامۆیەکم شەوێک نییە لەم هەوارەدا
مۆمێک بۆ دیدەنی مەرگ هەڵنەکەم،
ئەوەندە تەنیام لەم جیهانەدا بستێک بۆ سانەوە شکنابەم
نامۆیەکم بۆ گفتووگۆ لەسەر ڕاستیی پەنا بۆ تنۆکی باران دەبەم،
لە جوانیی نزیکدەبمەوە، چونکە ڕاستییم پێدەبەخشێت
ئەگەر بمەوێت ڕاستیی بدۆزمەوە، جوانیی بەدوامدا دەنێرێت،

پۆستی ژمارە (280)
پێنج شەممە ڕێکەوتی 28.06.2007 کاتژمێر 17:38

بمدۆزەرەوە ئەی مەرگی جوان
لێرە ئازارەکانی تەنیایی بۆم بۆتە خوان،
تەنیایی من، ئەوە نییە کەسم لە دەور نەبێت
تەنیایی من، ئەوەیە کەسێک نییە لێم تێبگات
کەسێک شکنابەم بە وتەکانم گڕاویی سوورهەڵنەگەڕێت،
نامۆم لە هەموو شوێن
زۆرن ئەوانەی بەردیان تێگرتووم
زۆرن ئەوانەی بۆ ژیانم پڕ دەرزیی ژانن، پڕ لە سوێن،
ڕۆژێک چییە گوڵێکیان دیاریی نەکردم
ڕۆژێک دەستێکی میهریان بۆ درێژنەکردم،
منی تەنیا تیشکی هەتاوێکم شکدەبرد ئازارەکانمی پێ مەرهەم کەم
بەری ئەو خۆرەشیان لێگرتم
کۆمەڵێک سەگی دەستەڵات بوون، هەریەکە لە شوێنێکەوە دەیانگەستم،

پۆستی ژمارە (281)
هەینیی ڕێکەوتی 29.06.2007 کاتژمێر 00 :25

بێ چرپە وەرە ئەی مەرگ
بێ بۆن بێ چرپە وەرە جێگاکەمەوە
ئەگەرچیی چواردەوی ماڵەکەشم گیرابێت بە سەگ،
بمبە بۆ شوێنێک، کە کەس نەیدیبێت، کەچیی لەوەتەی هەن لێیدەترسن
لەوەتەی هەن هەواڵی پێناسی تۆ لە قەشە و لە مەلا و لە جادوگەران دەپرسن،
وەک ئاشقێک خۆشمدەوێی، چونکە پێموایە لەلای تۆ ئاسوودە دەبم
بە دوور دەبم لە حەپەی سەگ، بە تەنها هاوڕێی تەنیایی دەبم،

پۆستی ژمارە (282)
شەممە ڕێکەوتی 30.06.2007 کاتژمێر 19:48

وەک خودایەک تەماشات دەکەن، چونکە توانای تەماشاکردنی بیرکردنەوەتیان نییە
لەسەرو ڕەخنەوە دایانناویت، چونکە توانای هەڵهێنانەوەی زمانیان لە ئاستتدا نییە،

تۆ نە خودایت نە لەسەرو ڕەخنەوە
مرۆڤێکی وەک من نەزانیت
لێ من هەست بە نەزانیی خۆم دەکەم، تۆش پێتوایە دروستکەری ژیانیت،

پۆستی ژمارە (283)
یەکشەممە ڕێکەوتی 01.07.2007 کاتژمێر 23:50

ئەم زریکانەی لە مێژووەوە دێنە گوێم
بە کوونی شماشاڵی حیکایەتخوێنێکدا تێپەڕیوون
ئەم "با"ی فرمێسکانە، کە لە مێژووەوە دێن
گەڵای درەختی ژانی سەدەیە هەڵوەریوون،
دە بێرە دەنگ ئەی نەی گۆرانییەکانی نیشتیمان
دە باڵی فریشتەیی لە خۆت بروێنە
ڕاستییم بۆ بگێڕەوە بە دەنگ، گوێکانم پڕ بکە لە نووزەی مێژوو، لە ناڵە و گریان،
با هاوارت بلەرێتەوە ئەی لاژەبێژ
دەستی کۆمەڵێک بگرە لەگەڵ خۆتدا بیانبەرەوە بۆ غەدری مێژوو
بە ئاگردا با تێپەڕن، ئەگەر دەستیان بۆ لقی درەختێک درێژکرد، با لێیانبێتە چزوو،
ئەی سترانبێژ
جوڵە بێنە بەر بەرد، دەنگ پەیدا بکە لە مرۆی خەوتوو
لە لەوێدابوونی کۆمەڵێکی گێژ،
ئەم ناڵانە هی مێژوون دێنە گوێم
لەگەڵ نۆتەکانتدا دەڕۆم، جوانیی ئەم مۆسیقایە ڕاستییەکانی ساڵانی غەدرە
وا دیسان دێنەوە سەر ڕێم،

پۆستی ژمارە (284)
دووشەممە ڕێکەوتی 02.07.2007 کاتژمێر 18:00

ئەی گەنج تۆ بەم هەموو برینانەوە، لە شاتووی وەریووی سەر ڕێگا دەچیت
هەموو ڕێگاکانت لێگیراوە، لە تەقینەوەی ئەم بۆمبای غەدرەدا، پێمناڵێیت: بۆ کوێ دەچیت؟
تۆ دەنکێ گەنمی نێو دەستاڕی دەستەڵاتیت، هەرکەسێک هەڵدەستێت دەتهاڕێت
پێشمەرگە پێڵاوە لاستیکەکانی مێژووی خۆیت تێدەگرێت
ڕۆشنبیر بۆ شەڕ سەر ڕێگاکانی ئازادبوونت لێدەگرێت،

ئازادبە ئەی گەنج لە بیرکردنەوەدا، تۆ بەرپرس نیت لە مێژووی ئەوان
بیری ئازاد بەرهەمی ئەقڵی تۆیە، ئەو تیرەی تۆ هاویشتووتە ناگەڕێتەوە ناو قەوسی کەوان،

پۆستی ژمارە (285)
سێ شەممە ڕێکەوتی 03.07.2007 کاتژمێر 16:34

ئەی مرۆڤە بەرزەکە، یەک وشەی جوان
یەک بزەی دڵگر، دەتوانێت هەمووومان دڵخۆش بکات
کەچیی یەکپارچەیت لە ڕق، بۆیە لەو ڕۆژەوە هیچ پەروانەیەک سەردانی باخەکەی تۆ ناکات،
با  ماڵی تۆ پڕیش بێت لە وەنەوشە و ڕیحان
با دیوارەکانت ڕازوەش بێت بە نیگاری جوان،
کە تۆ خاوەنی میهر و لێبووردن نەبیت، گوڵ و نیگاریش ڕزگارت ناکەن
هاوڕێیەتیی ناچاریی لە ژیاندا نییە
بۆیە چیدی گەنج نابینم، شەوانە شەمی وشەت هەڵبکەن،

پۆستی ژمارە (286)
چوار شەممە ڕێکەوتی 04.07.2007 کاتژمێر 08:15

لەگەڵ هەڵکردنی هەربایەکدا ئێوە خەنجەری خۆتان هەڵدەدەن
لە پشتتانەوە هەزارەها کۆیلە تەپڵی سەرکەوتنتان بۆ لێدەدەن
ئێمە بێ قەڵغان و شمشێرین
وشە چەتری سەرمانە
کۆمەڵێک مەلی ئاوارە و تەرەین، نە نیشتیمانێکمان هەیە
نە دەرختێکی باوەڕ شک دەبەین، بیکەین بە هێلانە،
باڵەکانی فڕینی ئێمە ڕاستیی و ئازادییە
ئەو تفەنگەی بییەوێت بمانپێکێت
جەللادی دەستەڵاتە، دژ بە دادپەروەرییە،

لەم ژیانە بێ ئابڕووەدا، ماف لەلای سۆزانییەک بەهادارترە وەک لە هی دادگا
یەکسانیی درۆیەکی گەورەیە، پارت ئەفیوونە بۆ کۆمەڵگا،

پۆستی ژمارە (287)
پێنج شەممە ڕێکەوتی 05.07.2007 کاتژمێر 09:30

هیچ چارەیەکی تر بۆ ئێوە نییە
یان ئەوەتا ئێوە ویستتان هەیە بۆ دەستەڵات و فەرمانڕەوایی کۆمەڵ دەکەن
یان ئەوەتا دەستەڵاتتان ناوێت و بەناچاریی "باشە" دەکەن،
کاری چاک جیهانێکی نامۆیە بە ئێوە
لێ تا ئەوکاتەی بێدەستەڵاتن دەیکەن، خەو لە چاوتان دەزڕێنن، ڕادەوەستن بەپێوە،
کاتێک دەمانەوێت ڕاستییەکانتان بناسین، بە خوێن نیشانمانی ئەدەن
نازانن، کە خوێن درۆزنترین بێژەری ڕاستییە
ژەهراوییەکەری دادە، پڕە لە ڕق، لە میهر و سۆز خاڵییە،

پۆستی ژمارە (288)
هەینیی ڕێکەوتی 06.07.2007 کاتژمێر 04:00

ئەم ڕەنجە بۆ بەختەوەریی دەدەم
شەکەتی ئەم کار و ڕێگایەم
کووخێکم دەوێت، بیکەم بە چەتری سەرم،
نانی تەوێڵی خۆم دەخۆم
ژیانێکی ئازاد دەژییم
ئەی خۆشەویستە شیرینەکەم، من بەتەنها دیلی ئەوینی تۆم،
لەژێر نمەی باراندا ڕێگای ماڵەوەم گرتووەتەبەر
پێی هەڵهێنانەوەم شلە، هێندە ماندووم نووزەم لێ نایەتەدەر،
دەزانم ئێستا لە شیریینی خەودایت
لێرەوە بە چاوی دڵ دەتبینم
گوڵێکیت لەژێر تریفەی مانگەشەودایت،

پۆستی ژماره (289)
شەممە ڕێکەوتی 07.07.2007 کاتژمێر 07:26

حەوتی حەوتی دووهەزار و حەوتە
هەستە دڵم، بەم بەیانییە سەدان پەروانەماچ، میوانی گوڵی لێوتە،
"با" یاریی بە پرچی درەختەکان دەکات، من بە هی تۆ
بولبول ماچی پەڵاسی نێو دەمی گوڵ دەکات
من ماچێکی بەیانیانت ناگۆڕمەوە بە باخێک شەوبۆ،

پۆستی ژماره (290)
یەکشەممە ڕێکەوتی 08.07.2007 کاتژمێر 22:17

چاوەڕێم لە دەرگای پەنجەرەکەم بدرێت
نامەیەکم ئامادەیە، ئەیدەمە دەست هەورێک بۆ نیشتیمانی بەرێت،
نیشتیمان ئێستانێ، سەراپای خۆی بە خەم داپۆشیوە
بولبولێکە سەدان ئاوازی بۆ هەڵکێشانی باڵی چڕیوە،
هاکا دەمەو ئێوارەیەک کۆترەشینکەیەکی وڵات بە دەنووک لە شووشەی پەنجەرەکەی دام
من بە هاتنی ئەو ڕەنگی نیشتیمان دەگرم، ئەویش بە پۆستی ئەمجارەم دەبێت سەرسام،
پۆستی ئەمجارەم بۆ درەختە بێداڵدەکانی خاکە
دەریایەکە لە دەنگ و واتا، بۆ ئایندەی منداڵان وەک نووقڵی شەوی بەراتە،

پۆستی ژماره (291)
دوو شەممە ڕێکەوتی 09.07.2007 کاتژمێر 18:30

لەدووڕراوە تێتان دەڕوانم
نووقمن لە ڕق لە کینە،
چوار وەرزەی ساڵ ڕەشن بە شەڕ، لە پێکەنیینیشتان بەگوومانم،
من لەگەڵ چاوکردنەوەی بەیاندا، دڵی مرۆڤێک بە بەیانیی باشێک خۆشدەکەم
ئێوە تف لە ڕووخساری ژیان دەکەن
باڵی مەلێک بە مقەست دەکەن،

پۆستی ژماره (292)

سێ شەممە ڕێکەوتی 10.07.2007 کاتژمێر 22:16

سووکایەتییمان پێبکەن هەتا دوا هەناسەتان
سەراپاتان دادەپۆشیین بە بێدەنگیی لە بنی پێ هەتا تەوقی سەرتان،
بێدەنگیی هونەرە، کە ئێوە نیتانە
ئێمە ئارام، ئێوەش پەلاماردان ژیانتانە،
لای لای کۆرپەی کورد لای لای
بە قاقا زمان بگرە
بۆ ئایندە مل بنێ، چەکی وشە هەڵگرە،
هیوامە پڕ بیت لە خۆری وتن
یەکەم هەنگاو، کە نات کاروانێک بێت بۆ سەرکەوتن،

پۆستی ژمارە (293)
چوار شەممە ڕێکەوتی 11.07.2007 کاتژمێر 20:13

بەقەد گڤەی ئەم "با"یە لێتان تووڕەم
ڕووبارێکم پڕ شەپۆل، ڕامانە هاژە و خوڕەم،
دەیان ساڵە تەنگ بە دەنگ هەڵدەچنن
جەردەن ڕێگا بە ئەستێرە و مانگیش دەگرن،
لەوەتەی هەن تاشە بەردی ڕقم تێدەگرن، ناشڵەقێم
من دێوانەی ئەم ڕێگایەم، ئازادییە کاروان و ڕێم،

پۆستی ژمارە (294)
پێنج شەممە ڕێکەوتی 12.07.2007 کاتژمێر 17:30

وەک دیمەنێک حەز بە تەماشاکردنت دەکەم
بەقەد گوڵێک ئارەزووی بۆنکردنت دەکەم،
کە دەدوێیت دەڵێی چرپەی "با"یت
باخچەیەکیت لە گوڵ و گوڵزار، هەمیشە دەرگا ئاوەڵایت،
نەبادە بیرم بکەیت، ناچارم دەکەیت بێمەوە
بۆنی هەناسەم دەکەیت، سەرت دەنێیت بە سەرمەوە،

که دێمه لات ئارام دەبم
نامۆیەکم سەرلەنوێ بە مرۆڤدۆستیی ئاشق دەبم،

پۆستی ژماره (295)
هەینیی ڕێکەوتی 13.07.2007 کاتژمێر 21:23

مرۆڤ بوونیەتێکی خۆویستە
سێبەرێکە دوای دەستەڵات کەوتووە
باوەڕدارێکی پارە پەرستە،
بیروباوەڕی پارەیە
دوژمنی ئەو ڕاستییە
جارێک بۆ کورسیی، جارێکیش بۆ زێڕ و خاک ئاوارەیە،

پۆستی ژماره (296)
شەممە ڕێکەوتی 14.07.2007 کاتژمێر 18:13

وەک پێ سووتاو بەپێوە خۆم ناگرم
شەکەتی ئەم ڕۆژگارەم، ئازارەکان دارەدارم پێدەکەن
بەرلەوەی بکەومە سەرچۆک دەستی نەمامێک دەگرم،
نەمامێکی لەدەست چەقۆ هەڵهاتوو
پەڵەپەڵەی برینەکانی لەشی، هەڵوەریوو بە وێنەی شاتوو،
ژوورێکی لێمدەوێت ڕازاوە بە گوڵ
پڕ بێت لە سەمای پەپوولە، لە جریوەی پاساریی
لە ئارامیی منداڵێکی بەختەوەر، لە دەیانجۆر ئەسپی یاریی،

پۆستی ژماره (297)
یەکشەممە ڕێکەوتی 15.07.2007 کاتژمێر 17:47

من وێڵی کاتم
مرۆڤێکم بێ ناونیشان

لەم جەنگەڵستانەدا، بەختەوەریی مرۆڤە ئاواتم،

پۆستی ژمارە (298)
دووشەممە ڕێکەوتی 16.07.2007 کاتژمێر 22:20

هاوڕێمبە لەم ڕێگایەدا
ئەم چرایە بەتەنها هەڵناکرێت
بەستەیەکی بێ مۆسیقام لەم خەنەبەندانی ئازادییەدا
لەگەڵمابە تەنها جارێک لە سەمای ئەم خەمەدا
من دەزانم چەپڵە بە یەک دەست لێنادرێت،
هاوڕێمان بۆچییە ئەگەر پێویستمان نەبێت؟
ئەو چرایەی شەڕ کووژاندیەوە، دەبێت بە دەستی ئێمە هەڵبکرێت،
وەرە با پێکەوە هەرچیی گابەردی بێ جوڵەی ڕێگایە گلۆری بکەینەوە
بوون بە جوڵەوە جوانە
با نەهێڵین مێژوو و ئاینده بە دەستی سوڵتانەکان بنووسرێنەوە،
لەوەتەی هەین لەم مەزادخانەی خاکەدا سەوای ئازادیی دەکەین
کۆمەڵێک دەنگ و دەستین، بۆچیی دەبێت هەموو دەمێک هەر ڕابکەین؟!
چەندیین باوەڕی جوداین
دەیان ساڵە کەلەپچە لە دەستی یەکدیی دەکەین
ڕەزی بەرهەمی یەکدیی دەسووتێنین، ئێمە وەهاین،
ناکرێت بە "با"یەک، کە پرچی شیعرت تێکدەداتەوە برەنجێیت
تۆ ئەگەر ستایشت دەوێت، دەبێت بەدوای ئازادییدا بگەڕێیت،
زۆرن ئەوانەی لە پارەدا دەوڵەمەند و لە ستایشدا هەژار
تۆ مرۆڤی ستایشی نەک پارە، ئاخر بۆیە لەوەتەی هەیت
نامۆیەکیت وێڵ و نەدار،

پۆستی ژمارە (299)
سێ شەممە ڕێکەوتی 17.07.2007 کاتژمێر 17:21

کاممانین ڕادەچڵەکێین، کۆتر بە شەقەی فڕیینی یان منی ڕاوەستاوی بەرپەنجەرەکە؟

ئەو منی بەدیکرد یان من ئەو
وا بووینەتە جێی سەرنجی تەواوی شارەکە؟
شەقەی فڕیینی ئەو هێشتا لە گوێمدا دەزرنگێتەوە
دەزانم ئەویش ئێستا، دوا نیگای من لە چاوەکانیا کاڵدەکاتەوە،
من ئەوم فێرکرد، هەرگیز لە نیشتنەوەدا چاو خافڵ نەکات
شەقەی فڕیینی ئەویش هەتا مردن بەرەو خۆرهەڵاتم دەبات،
لەبەر پەنجەرەیەکدا ڕادەوەستم
چاوەڕێی "با"یەکم لەناکاو بیگرێت دەستم،
وێڵی پۆستێکم بە هەوری نیشتیماندا پێمبگات
لە بولێڵی ئەم ڕۆژەدا بەرلەوەی هیچ کەسێک ڕووناکیی ئێوارە هەڵبکات،
هەر ڕۆژەی پۆستێک دەخوێنمەوە
لەگەڵ هاواری هەر پیتێکیدا ئازارێکی نوێ دەنووسمەوە،

پۆستی ژمارە (300)
چوارشەممە ڕێکەوتی 18.07.2007 کاتژمێر 21:52

لێرەوە هەتا چاو بڕبکات تێت دەڕوانم ئەی دەریا
جیهانێکی پڕ پرسیاریت
تۆ ئەو هێزەیت، کە نهێنی ژیان وا لەژێر سەریا،
بە نەرمەپێ بەسەر ئەم لمەدا ڕێگا دەبڕم
لە دەستەڵاتت دەڕوانم
هەتا بۆم بکرێت چاو داناگرم،
تۆ کۆمەڵێک یەکەی هێزیت، هەمووشتان پێکەوە ویستێکن بۆ دەستەڵات
پێکەوە فەرمانڕەوایی جیهان دەکەن
لە باکوورەوە بۆ باشوور، لە خۆرئاواوە بۆ خۆرهەڵات،

پۆستی ژمارە (301)
پێنج شەممە ڕێکەوتی 19.07.2007 کاتژمێر 18:34

پێموایە من وام، لێ کێی تر دەیەوێت هەمیشە بیربکاتەوە؟
زۆرجار هەر من بووم، بەڕاستیی بیریشم لە هیچ نەدەکردەوە،*

کێن ئەوانەی دەڵێن: هەمیشە واین لە خەمی خاکدا؟
با بێنە بەردەمی من کراسی شەرمەزاریی ئەکەم بە بەریاندا،
ئەوانە لە خەمی خۆیاندا نەبێت لە هیچی تردا نین
بە ڕەنگ و ڕۆ خاکپەروەرن، کەچیی لە ڕاستییدا دز و جەردە کۆمەڵێک دڕندەی کێویین،
بە من دەڵێن: بیر لە چیی دەکەمەوە؟
لەوەتەی هەم گیری بەردەمی دەرگایەکم و نایکەمەوە،
من کۆکەرەوەی پیتم، ئەوەی من بیری لێدەکەمەوە هیچ نییە
ئەوەی ئێوەش بیری لێدەکەنەوە، سەرمایەی زۆر، دەستەڵات و کورسییە،

* لە هۆنراوەی ( من )ی (فریدریش شیللەر)ەوە، لاپەڕە 354
Friedrich Von Schiller: Gedichte und Balladen.

پۆستی ژمارە (302)
هەینیی ڕێکەوتی 20.07.2007 کاتژمێر 19:12

زۆر شت هەن ئەدرەوشێنەوە، لێ هیچیان وەک شەپۆلەکانی دەریا نین
هیچیان وەک جوڵە و هەڵچوون و داچوونی ئەو جوان نین،
من درەوشانەوەیەکی بزێوم لا جوانە، وەک کەوانی پەلکە زێڕینە
وەک شەونمی سەر گوڵ، وەک ئۆقیانووسەکانی ئەم زەمینە،
هیچ بریسکەیەک لە هی ئاو ناچێت
با زێڕ سەد هێندەی ئەو جوانتر بێت
لێ جەستەی من درەخت ئاسا بەس تنۆکی ئاو لە سینەی دەگرێت،

پۆستی ژمارە (303)
شەممە ڕێکەوتی 21.07.2007 کاتژمێر 16:05

هەر ڕۆژەی "با"یەک لەو دیوو کیشوەرە نادیارەکانەوە هەڵدەکات
هەرجارەی غەدرێک دەست بە تووڕەکەی ژیانماندا دەکات،
من لافاوێکی دوو سەرەی خودایەک لێیداوم، باکوور و باشووری لێترازاندووم
گەشێک لە جیهانمدا بالادەستە وەک درەختی پاییز هەڵیوەراندووم،
هەنووکە پرسەدارێکی تەنیام

پرسەی مەرگی هەزارەها وشە دەگێڕم
ئەو کۆرپە پیتانەی، تەمەنێک لەگەڵیاندا ژیام،

پۆستی ژمارە (304)
یەکشەممە ڕێکەوتی 22.07.2007 کاتژمێر 07:33

کەی بیردەکەیتەوە؟
چاوەڕوانم پەردە لەسەر ڕاستییەکان هەڵبدەیتەوە،
تۆ پێویستت بە ڕووناکییە
چاودێرێکیت لە ڕاماندا ماندووبوونت نییە،
بیرکردنەوەی تۆ لە ژیانی نیوەڕۆدایە
زەردەشتێکیت ماڵت لە باخی هاوییندایە،
بیرکردنەوەی تۆ بە ستوونیی لەگەڵ خۆری نیوەڕۆدا پەلدەهاوێت
نهێنیی سێبەرە ڕەشەکانی کەنار دەپشکێت،
لێرەوە ناسیینەوە سەرهەڵدەدات
بیرکردنەوە دەبێتە "با" هەوری بەردەمی نهێنییەکان لادەبات،
ئای، کە وێنەکانی بیرکردنەوەت جوانن
یەکپارچە ڕەنگی خۆرن
نیوەڕۆن بۆ ڕوانین، کۆمەڵێک ئاوێنەی هەمەجۆرن،

پۆستی ژمارە (305)
دوو شەممە ڕێکەوتی 23.07.2007 کاتژمێر 11:24

ئەو ڕۆژانەت بیر دێتەوە، کە لەسەر کەنارەکانی مەرگ و ژیاندا ڕاوەستابوویت
پێشمەرگەیەکی برسیی و نەدار، چرا ئاسا بۆ ئازادیی هەڵکرابوویت،
هەنووکە لەژێر شەقی جەللادەکانی هاوڕێتدا دەناڵێی
زیندانییەکی چارەڕەشیت، ساتێک چییە لە ئەشکەنجە دانابڕێی،
تاوانە ئەزییزم لەم خاکەدا بە کەسێک بڵێی گەندەڵ
لەبەردەم دادوەریی ئەواندا، ئەوان بیگەردن وەک گوڵ، تۆش ناپاکێکی چەپەڵ،
بە پەیژەی ئەم هەموو ئازارەی خۆتدا شۆڕبوویتەوە بۆ ناو خۆت
مردنت لەلا جوانتر بوو

بەنەخوێنی شەڕواڵەکەت بە پەنجەرەکەدا هەڵواسیی بۆ خۆخنکاندن
بەنەخوێنەکەت بچڕا، مردن بە میوانت نەبوو،
هەنووکە لە جەستەی خۆشتدا نامۆیت
بە نووکی پەنجە لە دیوارەکانی زیندان دەدەیت
کەس گوێی لە نوزەی خنکاوی تۆی تەنیا نییە، ئازارێکی شاراوە و سەرەڕۆیت،
بیر لە ڕۆژی فالنتین بکەرەوە
بە ئەشق ئەم ئازارە ببەزێنە
یاخییەکی سەرکەشبە، سەر بۆ پێشمەرگە و جەللاد دامەنەوێنە،
با دڵت جۆرێکی دی لێبدات
وەک چۆن ڕیتمی دڵێکی ئازاد لێدەدات،
ئاستەمە جیاوازیی نێوان بەعس و ئەم دەستەڵاتە بکەیت
ئەم بەعسە کۆپییە هێند ڕاستە، ناهێڵێت پەی بە ڕەسەنەکە ببەیت،

پۆستی ژمارە (306)
سێ شەممە ڕێکەوتی 24.07.2007 کاتژمێر 18:38

پێمان دەڵێن ئەم نەخۆشییە دەبێت چارەسەر بکرێت
دەروێشی دەستەڵات و پاسەوانەکانی نەما بەردمان تێنەگرێت،
دەترسن لە دەنگی ئازاد، لە وتەی بوێر دەترسن
لەهەرکوێیەک وشەیەکم بەدی بکەن، هەرلەوێدا پەتی سێدارەی بۆ هەڵدەواسن،
نیشتیمانم کۆترێکی پەڕوەریووە
ئازارێکی ماڵە و ماڵکەر، فرییانیان لەبیربردۆتەوە،
ئەی نیشتیمانە هەتککراوەم، هەرچەند لەمێژە لێتدابڕاوم
لێ تا ئێستا نۆتەی ئازارەکانت بە کەمانی دوورییت بۆ نامۆییم لێئەدەمەوە،
هەموو ڕۆژێ بە هەورێکدا پۆستێکی گلەییم بۆ دەنێریت
گرمە و ناڵەت پڕ بەسوێیە، ئەفسووس ڕۆژێک بەبێ گریان ناسرەویت،
جاران من لە تۆدا دەژیام، هەنووکە تۆ لەمندا دەژییت
نیشتیمانێکی بەئەمەگیت، ژانەکانم لە پێلوی مێژووتدا بۆ هەڵدەگریت،

پۆستی ژمارە (307)
چوارشەممە ڕێکەوتی 25.07.2007 کاتژمێر 15:39

لەهەرکوێ مردم، بمسووتێنن
با جەستەم ببێتە خۆڵەمێش
بە دەم "با"وە هەڵمبدەن، وەسێتم لەخۆتان مەتۆرێنن،
کوردستان لە ڕۆحما دەژیی، مشتێ خاک و خۆڵ نییە
ئەوەی ڕێگا لە گەڕانەوەم دەگرێت، ترسنۆکێکی لەخۆباییە،
ئەوان زەویی و ئاو و دەستەڵاتیان لەو نیشتیمانە دەوێ
من هەنووکە باوبژێکم* هەموو هەڵکردنێکم گۆرانییەکە بۆ باوالێ*

*باوبژ: تۆز و خۆڵ، کە "با" دەیهێنێ
* باوالێ: خۆشەویستیی و ڕێز بۆ باوک
کە دەڵێم: دوای مەرگم بمسووتێنن و خۆڵەمێشەکەم بدەن بەدەم "با"وە، دەمەوێت وەک ئەو تۆز و خۆڵەی، کە "با" دەیهێنێ بە خۆشەویستیی و گۆرانییەوە بگەڕێمەوە بۆ نیشتیمان بەبێ ئەوەی هیچ هێزێک هەبێت ڕێگا لە گەڕانەوەم بگرێت، هەربۆیە باوبژ و باوالێم کردووە بە کۆتایی ئەم پۆستەی ئیمڕۆ.

پۆستی ژمارە (308)
پێنج شەممە ڕێکەوتی 26.07.2007 کاتژمێر 22:45

چۆلەکەکان بە جریوە هەڵیاندەستاندم، منیش بە دارلاستیک دەمکووشتن
قومرییەکان نیوەڕوانیان پڕ دەکردم لە نەغمە، منیش بە تەپکە دەمگرتن،
ڕەنگاڵەکان ئێوارانیان بە نۆتە ڕەنگدەکردم، منیش لە پاداشتدا لە قەفەزێکی تەنگم دەکردن،
ئەمە منداڵیی منە
بۆیە هەنووکە ئەگەر ڕۆژێک، ماچی نەغمەیەکیان نەکەم
ئەو ڕۆژەم ڕۆژێکی ونە،

پۆستی ژمارە (309)
هەینیی ڕێکەوتی 27.07.2007 کاتژمێر 18:34

دەنگم بە ئاستەم دەردێ گوڵم
وەرە لە باوەشما ڕاکشێ، سەری حەسرەتت بخە سەر دڵم،

دەمەوێت بۆنت بکەم
دەمەوێت بتکەمە نۆتەیەک لە ئاوازی شیعرێکما هەڵتبگرم،
دەوام ناوێ، تۆ دەرمانی گشت دەردێکیت
ئەو مەرهەمەی، کە لەسەر قڵیشی هەموو زامێک دەکرێیت،
دەمەوێت لە باوەشتا بنووم
هاوێرێکم* دەمەوێت خۆمت تێهەڵبسووم،

هاوێر: کۆرپەی لەدایک دابڕاو

پۆستی ژمارە ( 310)
شەممە ڕێکەوتی 28.07.2007 کاتژمێر 09:22

ئەو ڕۆژەی لە باوەشم گرتیت پشکۆیەک بوویت
ئەو ڕۆژەی دەستمگرتیت، بورکانێک بوویت،
لەمپەڕی دونیاوە بۆ ئەوپەڕی لە گلێنەی چاوەکانما هەڵمگرتیت،
لە هەر جێگایەکدا دڵۆپێ فرمێسکت ڕشت گوڵێک ڕووا
قەقنەسێک بوویت، پێیەکت لێرە و پێیەکت لەوێڕا
مێژوویەک بوویت لە تێهەڵدان، چرایەک لەسەر گریەت هەڵنەکرا،
پیاسەکردن لەگەڵ تۆدا، ڕۆیشتنە لەگەڵ ئاگردا
ئەو کڵپە و گڕەی هیچ کەس ناوێرێت بڕوات بەلایدا،

پۆستی ژمارە (311)
یەکشەممە ڕێکەوتی 29.07.2007 کاتژمێر 11:55

من توانای جیاکردنەوەی ئەم دوو ئاگرەم نییە
ئەمیان ساختەیە، لێ لە ناوەڕۆکی ئەوی تریان خاڵی نییە،
ئەم ئاگرە کاتێک دەڕوانێت، چاوانی دوو چاوی گیانداریکە لەکاتی ڕاودا
کاتێک هاوار دەکات، وێڵە بەدوای نێچیردا،
ئێمە هەموو نێچیری ئەوین
هەموومان ڕۆح و گیان سووتاو، کارمامزی نووستووی شەوین،

ئێمە ئەگەر هەموو پۆلیسی ئەو نەبین، بە جامێک ئاو دەیکووژێنینەوە
وەرزێکی نوێ بەرهەمدێنین، لەبری خەم قاقا و خۆشیی ئەچنینەوە،

پۆستی ژمارە (312)
دوو شەممە ڕێکەوتی 30.07.2007 کاتژمێر 04:50

ئەم شیوەنە بۆ کێ دەکەیت
ئەم هاوارانە بە گوێی کپی کێدا دەدەیت؟
کێ هەبێت بەم کازیوەی بەیانییە، ئێخەی بگریت
دەتەوێت سەری کاسی کام خودا لەم تارییک و ڕوونەدا وەکوو مەشکە بشڵەقێنیت،
ئەی نەورەسە شیینکەیییەکە شیوەنی کام بەلەمی ون دەکەیت؟
لەم گەرووە پڕ پرسەیەدا بانگی مەرگی کێ ئەدەیت؟
چ پۆستێکت پێیە بەقەد تەمومژی ئەم بەیانییە ئاڵۆزبێت؟
ئەگەر خەمی نانی ڕۆژ نەبێت، دەبێت چ خەمێک بەقەد دەنگدانەوەی گریەی تۆ پڕ ناریین بێت؟

پۆستی ژمارە (313)
سێ شەممە ڕێکەوتی 31.07.2007 کاتژمێر 06:00

هاوڕێکەم کیژێکی نەشمیلانەی ڕۆمانێکە دەڵێ:
سەگێکی باش لە دایک و باوکی دەچێت
لێ ئەم سەگەی ناو دەروونی من لە خۆم نەبێت لە هیچ کەسێکی تر ناچێت،
بەم هەموو هەستە لێوان لێوەوە
بەم هەموو ویستە تینووەوە، بەرەو لات دێم
مرۆڤێکم تینووی ئەو سێبەرەم
لە بوونمەوە هەتا ئێستا سەوداسەری ئەم ڕێگایە و باڵندەیەکی ماندوو و تەرەم،

پۆستی ژمارە (314)
چوار شەممە ڕێکەوتی 01.08.2007 کاتژمێر 05:46

شەهید نین ئەوانەی لەناکاو لە کارەساتێکدا دەکووژرێن

دەشێت وەک گەڵای درەخت لە پاییزێکی ناوەختدا هەڵبوەرێن،
یان وەک مەلێکی ڕەنجاو سەری خۆیان هەڵبگرن و بتۆرێن،
ئەوانە کارتی ڕاکێشراوی قوماری سەر مێزێکن
لەپێشی دەستەڵاتەوە دەنگێکن بۆ کپکردن
لەدواوەیەوە لە قەیراندا سێبەرێکن،

پۆستی ژمارە (315)
پێنج شەممە ڕێکەوتی 02.08.2007 کاتژمێر 18:59

گوومان لە سێبەرەکەی خۆشم دەکەم
شاعیرێکی ڕەشبینم، هەمیشە بەردبارانی دەستەڵات دەکەم،
ئەمە نیشتیمانی منە
گۆڕان تێیدا منداڵێکی لاوازی شەرمنە،
لەنێوانی گوومان و هیوادا دوورگەیەک شکنابەم بۆ حەوانەوە
لەناو کڵپە و تینی ئەم ئاگرەدا قوومێک ئاو شکنابەم بۆ کووژانەوە،
لەبەینی دوو باوەڕدام، کورسییەک نییە لەسەری دابنیشم
ئەمیان شکاندوویەتی قاچ و دەستم
لە شەڕی ئەویاندا درێژ بووە هەناسە و ڕیشم،
من لەم غەدرەدا زمانم گرتووە
درەختێکی پژوپۆ شکاوم دەیان هێلانەی قاچاخم بە پێلووی چاو هەڵگرتووە،
دەرەختێکی گازەڵییم گەڵاکانم ڕەنگی گوومانیان گرتووە،
گوومان ژەنگاوییە
هیوا تێیدا خنکاوە
جیهانێکە باوەڕ تێیدا ئەسپێکی کێوییە،

پۆستی ژمارە (316)
هەینیی ڕێکەوتی 03.08.2007 کاتژمێر 06:00

بە چرپە لەگەڵت دەدوێم، بە مۆسیقا بە ئاگات دێنم
گوڵی ماچت تێدەگرم، بۆ شیعرێ دەتکەمە هەوێنم،
پۆستێکم پێیە لە هیچ هەواڵێک ناچێت

چرایەکم پێیە بە دەنگ نەبێت بە هیچی تر هەڵناکرێت،
ئەگەر ئەم وڵاتەی ئێمە دەوڵەمەند دەبوو لە دەنگ
نیشتیمانێکمان دەبوو لێوان لێو لە ئەشق، خاڵیی خاڵییش لە جەنگ،
جەنگ بازاڕی شاردنەوەی ڕاستییەکان زۆرتر دەکات
خوێنڕشتن "با"ی هەڵهاتن لە گشت لاوە هەڵدەکات،
لە جەنگدا تاوانباران سەردارن
قوربانییەکان دەنگ بڕاو، گەڵای سەر ڕێ، کۆمەڵێکی برسیی و هەژارن،
لە ئاشتییدا دادپەروەریی سەروەرە
جێگای تاوانباران قەفەزی دادگا
ئەی قوربانییە ڕۆح سووتاوەکەم، ئەم جاشە لێرە دابنێ
ئەو سەردارەش بۆ بەردەمی دادوەر بەرە،

پۆستی ژمارە (317)
شەممە ڕێکەوتی 04.08.2007 کاتژمێر 05:32

بەم سپیدەی بەیانییە دوعا بۆ کێ دەکەن؟
بەم چرای دەم بەیانییە ملوانکەی خەمی کێ لە گەردن دەکەن؟
ئێوە هێند خەمی دونیاتان لەخۆ گرتووە گەردنتان شیین هەڵگەڕاوە
قەقنەسن جەستەتان بە گڕی گریەی ژیان هەڵپڕووسکاوە،
دوعا دەکەن هەموو دەم بەیانییەک، وەک ئەوەی سەرەی مردنتان بێت
یان ئازیزێکتان لەسەر لێواری مەرگ ڕاوەستابێت،
من لەمێژە دەستبەرداری دوعاکردن بووم
کەچیی هەموو ڕۆژێ بە دەنگی دوعای ئێوە هەڵدەستم
هەموو بەیانییەک فرمێسکی قەتیسماوی چاوەکانم بە نۆتەی مۆسیقای ئێوە دەسڕم،
چەند خۆشە بەیانیان بە دوعای ئێوە لە خەو هەڵبستم نەک بە بانگی مزگەوت
پەڕاگەندەیەکی چارەنووس لێڵم، ژیانم پڕە لە مەینەتیی
لێوان لێوە لە خەمی هەڵکەوت،
دوعا دەکەن بۆ بەیانییانێک ئێوە
کۆمەڵێک نەورەسی خەمبارن، ڕەنگی کرۆزتان لاسوورە بە وێنەی سێوە،

پۆستی ژمارە ( 318)
یەکشەممە ڕێکەوتی 05.08.2007 کاتژمێر 14:55

به دەنووک لە دەرگای بەیان دەدەن
بە نارییینێکی دڵتەزێن بانگی هەڵهاتنی خۆر ئەدەن،
چ خەمێکە لەم گەرووە هەراسانانەوە دێنە گوێم
چ بێسانەوەیەکی جەرگبڕە وامليێدەکات بەرەو جێیەکی دی هەڵبێم،
کام دوعای دی بەردە باران دەکرێ
کام شەوبۆی دی گەردنلغی بووکێنیی لە گوللە بۆ دروستدەکرێ؟
خڕخاڵی کام پێ لەقەی مامە، تەنگە بۆ دەستی بەناز؟
هاواری سووتاوی کام کیژی ترە لەگەڵ خەمەکانی هێشوودا دەستەخوشک و هاوڕاز؟
دە پێمبڵێن شینی کێ دەگێڕن
ئەی نەورەسەکانی خەمی ڕۆژانەم، هەموو ڕۆژێک ئێوە لەگەڵ بیرکردنەوەمدا خاوەنی یەک هەست و دێڕن،

پۆستی ژمارە (319)
دوو شەممە ڕێکەوتی 06.08.2007 کاتژمێر 08:52

لەمسەری شەقامێکی شڵەژاوەوە بۆ ئەوسەر
لەمبەرەوە منداڵێکی پێنج ساڵە، خەمی ونبوونی لە چاوانیا دەگوێزێتەوە بۆ ئەوبەر،
ترس لە نێوەندی پەنجە درەکانی خۆی ناوە
منداڵێکە خەمی گەورەی دایکی لە شان ناوە،
ئارامیی باڵندەیەکی باڵقرتاوی ئێستای ئەوە
ڕۆژی ڕووناک لەلای ئەو جەنگەڵستانی شەوە،
لە ناوەندی شەقامێکدا هەوری هاوار لێی ئەدات
بروسکەی ترس درندەیەکە بەسەر جەستەیدا باز ئەدات،
هاوار دەکات و دەڵێ: دایە... دایە... دایە
منداڵێکی پێنج ساڵانە ترس ئەژنۆی پێکاوە و خەمی دایکی لە چاویایە،

پۆستی ژمارە (320)
سێ شەممە ڕێکەوتی 07.08.2007 کاتژمێر 09:45

سروشت ئاوێنەیەکە، تێیدا تەماشای خۆمان دەکەین
یەک یەکتر دەبینین، ئەو دەمانەی تەناف بۆ یەکدیی هەڵدەخەین،
ئێمەی مرۆڤ هێشتا وەک سەرەتا نەزانین

تینووی خوێن و کۆمەڵێک دەستەڵاتداری زۆردارین،
وەک جارانین، لێ نامانەوێت بیرمان بێتەوە
ژیانێکی مۆدێرن دەژیین، کەچیی بریینەکانمان بە هەزارەی یەکەم ئەکوولێتەوە،
جیهانگیریی ئازادیی نەکردین
ئەو ڕاوچییەکی لێزان بوو، وەک باڵندە لە قەفەزدا کەوییکردین،
سەربازێکی شەڕانگێز بوو
لە پانزدەی سێپتێمبەرەوە* فێری تەقینەوە و خۆکووژیی کردین،

* کارەساتی 11.09.2001 ئەمریکا، تەقاندنەوەی پەنتاگۆن بە دوو فڕۆکە لەلایەن تیرۆریستانی ئەلقاعیدەوە.

پۆستی ژمارە (321)
چوار شەممە ڕێکەوتی 08.08.2007 کاتژمێر 10:15

هەورێک دابەزیی ماچیکردم
من پەڕاگەندەیەکی ئەژنۆ شکاو بووم
"با"یەک هات پێی پێگرتم،
لە باڵەخانەی ئەم ترافیەیەوە تەماشای نیشتیمان دەکەم
دەبینم کۆمەڵ واق وڕماوێکە هەنگاو شل
دەستەڵات پڕ چەک و پۆشتەوپەرداخ
ئەویش لانەوازێکی بێ قەڵغان و جل،
کۆمەڵ هیچ توانای نەماوە
دەستەڵات لە چاوانیا درەختی ئارامیی و توانای ئاژەڵێکی لەکاتی ڕاودا لێ ڕوواوە،

پۆستی ژمارە (322)
پێنج شەممە ڕێکەوتی 09.08.2007 کاتژمێر 09:56

ئەو پاڵەوانەی بۆ ئێمە دەجەنگێت
ئەو چاوە گەورەکانی لەجیاتی چاوە کوێرەکانی ئێمە دەبینێت،
بەندتر و کوێرترمان دەکات

ئازادیی و ناسینەوە لە خودەوە دەستپێدەکات
تۆ ئەگەر لەسەر لوتکە ڕانەوەستیت، هەرگیز "با"ی سەرکەوتنت تێدا هەڵناکات،

پۆستی ژمارە (323)
هەینیی ڕێکەوتی 10.08.2007 کاتژمێر 09:10

خۆشمدەوێیت بەقەد بوونم، لێ بۆم نییە بتبینم
لە ڕۆحما هەڵمگرتوویت، تۆیت هەناسەم، تۆیت ژیینم،
دەمەوێت لە ئامێزت بگرم
جار لە دوای جار خوڕەی ڕووباری ئەشکت بسڕم،
دەمەوێت بێمەوە لات
ماچی تەوێڵی سووتماکت بکەم
دەمەوێت بتنووسێنم بە خۆمەوە، دەمەو بولێل شەمێک بۆ خەمت هەڵبکەم،
ڕێگام نادەن بتبینمەوە ئەی نیشتیمان
لێناگەڕێن خۆشمبوێیت ئەی کوردستان،
ئەی خاکی من خاکی خەم
ئەی نیشتیمانی هەتککراوی من، وڵاتی شەم،
ئەی کوردستانە بێ باوکەکەم
ئەی خاتووزیینە لە خاچدراوەکەم،
لە خۆمدا هەڵمگرتوویت، بست بە بست لەگەڵ خۆمدا دەتگێڕم
ئازارێکی گەڕیدەم، دەنگێکی کپ نەکراو وتەیەکی نەوتراوی بوێرم،
لێرەوە بەیانییان نەورەسەکان بە گریان خەمەکانی تۆم بۆ دەگێڕنەوە
تاریک و ڕوون ئەو دەمەی خودا و شەیتان لەسەر دابەشکردنی خێر و شەڕ شەڕیانە
من لێرە نۆتەی ئازارەکانی تۆ بە فلووتی "با" دەنووسمەوە،
نامۆیەک نیم وەک "نالیی"، کەچیی ڕۆژ نییە گریانی تۆ لە پۆستێکدا نەخوێنمەوە،
بەیانیان زوو ئەو دەمەی نەورەسێک دەگریی
لە باوەشی تۆدا فریشتەیەک دەمرێت
غەدر لە درەختێکی بێداڵە دەکرێت،
ژن دەکووژرێت
ئازادیی لەگەڵ هەڵهاتنی خۆردا گوولەباران دەکرێت،
لێرەڕا بەیانیان لە شیوەنی نەورەسەکاندا
لەوێشڕا لە چاوەڕوانیی هەواڵی کووشتنی ژنێکدا،
ئەهریمەن لە نانەواخانەیەکدا سەرە ناگرێت، بە ستایشی ئاهووراوە

دەستەوارەیەک نانی کوردیی ئەدەنێ،
ئیمامێک لە زەلکاودا دەستنوێژ دەشوات، مجەورێک پێڵاوە خوێناوییەکانی بۆ هەڵدەگرێ،
بەیانیان ئەو دەمەی نەورەسەکان بۆ هەتککردنی تۆ دەگریین
دەیان پیاو دوای کووشتنی کچەکانیان
ژنەکانیان بە ڕەفتەکانی سەریان
شوێنەواری خوێنی وشکبۆوەی سەر دەستیان بۆ دەسڕیین،
هەموو سپیدەیەک گوێم لێیە، نەورەسەکان دوعا دەکەن
دوعا بۆ مەرگی دوعاکانی* تۆ دەکەن،
دوعا بۆ تەنیایی و ئازارەکانی تۆ دەکەن،
ئەی نیشتیمانە هەتککراوەکەم
شۆڕشگێڕەکان دوژمنیان نەخستە ژێرپێتەوە
تاوان هەتاوەکوو ئێستا سەردارە، ئەوە تۆیت پەتکراویت
بوویتە پەڕۆی دەستی غەدر، سیاسەت پۆستاڵەکانی پێیت پێ دەسڕێتەوە،
ئەی خاک و ئاوەکەم ئەی کوردستان
پێشمەرگەکانیش هەتکیان کردیت
دەست و قاچی دادپەروەرییان شکاند
قوربانییەکی بێ شمشێر و قەڵغان بوویت
کەچیی وەک جەللاد بە کێر د و چەقۆی مۆدێرنەوە لە زبڵدانی مێژوویان کردیت،
هەرچییەک هات غەدری لێکردیت
هەرچییەک هات کردیتییە پێڵاو لە بۆنەکانی مەزادی دادا لەپێیانکردیت،
هەنووکە تۆ ئەو ژنە دیلەیت، کە شەهوەتی پیاوانی هەموو دونیا لەسەر سنگت جێماوە
ئەو نیشتیمانە هەنجن هەنجنەی، بتسە زەمینێکت بۆ چاندنی گوڵێک تێدا نەماوە،

* دوعا: دوعای ئێزیدیی حەڤدە ساڵە، کە دڕندانە بە زیندوێتیی لە بەعشیقە بەردبارانکرا.

پۆستی ژمارە (324)
شەممە ڕێکەوتی 11.08.2007 کاتژمێر 09:10

ئەی خۆشەویست لە کووشتنی ڕووناکییدا دەستێک مەبە
لە سووتانی خەزاندا هەوڵبدە گڕێک مەبە،
ئەی خۆشەویست کاتێک باران ڕقی لێدەبێتەوە، تووڕەمەبە
کاتێک مانگەشەو بە دیتنت بێزارە، تەقە لە تارییکی مەکە،
کە تۆ ڕقت لە گڤەیە لە ناوەندی شەقامێکی ڕووتدا تف لە ڕەشەبا مەکە،

من، کە پەنجەکانم جەنگ هەڵیوەراندوون چەپڵەم بۆ تۆ پێ لێنادرێت
من، کە گەرووم لە تینوێتییدا تەشەنای کردووە
بەدەم تۆوە قاقام پێ لێنادرێت،
من، کە لەژێر کاردا شەکەت دەبم، توانای تەماشاکردنی پۆشاکی تۆم نییە
من، کە لەژێر جەوری ژیاندا، لەسەرخۆ دەمرم
دەمی خەنیینم بۆ کارەکانی تۆ نییە،
پێم پێمەکەنە ئەی خۆشەویست، کە دەزانیت نەورەسێکی تەرم و فڕیینم بیرچۆتەوە
"با"یەکی سەرهەڵگرتووم بە هەر دەربەندێکدا تێدەپەڕم، ئازارێکی نوێ دەمنووسێتەوە
ماچی تەوێڵی هەر هەورێک دەکەم، ئەو ڕۆژانەم بیردەکەوێتەوە
کە چەقۆیەکت کردە گیرفانمەوە و گووتت: ئەمە نانە
مشتێ بارووتت کردە جانتاکەمەوە و گووتت: ئەمە تۆوی ژیانە،
داوای مەرهەمێکم کرد بۆ برینەکەی سەر سینەم
گوللەیەکت خستە دەستمەوە
بەرلەوەی ماڵئاواییت لێبکەم دەرگای ڕقێکت بە ڕوودامدا کردەوە،
داوای قوومێک ئاوم کرد، گڕی شەڕت لە گەرووم بەردا
زەردەشتێکی سووتاو بووم، سەگی تۆڵەت تێمبەرئەدا،

پۆستی ژمارە (325)
یەکشەممە ڕێکەوتی 12.08.2007 کاتژمێر 21:24

من بەم ژانەوە لەدایکبووم
گەڵایەکی وەریووی پاییز، قوربانییەکی تێهەڵدراو بووم،
ئەم ژانە چیرۆکم دەنووسێتەوە
مۆسیقایەکە دەمگرینێ، بە لاوک و حەیران ئەملێتەوە،

پۆستی ژمارە (326)
دوو شەممە ڕێکەوتی 13.08.2007 کاتژمێر 10:37

کێ توانای گوێگرتنی هاواری قوڵنگی هەیە
کام ئازار وەک مەرگی ئەو گریەی تیایە؟
کەروێشکەکان پێش مردنیان دەگریین

لە دیدەنی مەرگیاندا، تا هەتایە زریکەیان لە یادمانا هەڵدەگریین،
قوڵنگێک بەرلە مەرگی سروشت دەلەرێنێتەوە
قوربانییەکە مەرگی بە هاوار دەنووسێتەوە،

پۆستی ژمارە (327)
سێ شەممە ڕێکەوتی 14.08.2007 کاتژمێر 12:56

کە بارانێک لێمدەدات ژانە نووستووەکانم بەئاگادێن
دەمگریەنن تا ئەوکاتەی واهەستدەکەم
هەرچیی بەردی سەرڕێگایە بەرەو نێوچەوانی من دێن،
لەگەڵ هەموو تنۆکێکدا ئاهێک بۆ ئازاری تۆ هەڵدەکێشم
شاعیرێکی نەفرەت لێکراوم وەک ئازارەکانی تۆ ژانە بەشم،
لەگەڵ هەموو گرمەی هەورێکدا گوێ لە بێدەنگیی تۆ دەگرم
لە دیتنی هەر بروسکەیەکدا سکێچی خەیاڵم لە چوارچێوەی مەرگی تۆ دەگرم،
ئەی خاوەنی گەورەترین ژان، ئەی دوعا
لە ڕۆژێکی خۆرەتاودا وەرە بمبە بۆ لای خۆت
بمکە بە هاونشینی لای خۆت بەبێ پاڕانەوە و بەبێ تکا،

پۆستی ژمارە (328)
چوار شەممە ڕێکەوتی 15.08.2007 کاتژمێر 07:14

بەدەم کزەی بەیانەوە دەبێت دەرگا لە غەدرێک بکەمەوە
دەستێکە دەیەوێت نەمامی خەندەم بشکێنێتەوە،
بۆرانێکە جێگاپێی گوڵ هەڵدەگرێ
غدرێکە ژان دەفرۆشێ و لە جێگایدا خۆشیی دەوێ،

پۆستی ژمارە (329)
پێنج شەممە ڕێکەوتی 16.08.2007 کاتژمێر 12:45

بەم گەوەی شاخی غەدرەدا هەڵدەزنم
من هاواری دوعاکانم
من ژنم،

لەگەڵ گابەردی ئەم شاخی غەدرەدا یەک لە دووی یەک تلتان دەکەمەوە
جوڵەیەکی توورەم لەگەڵ قیژەی هەر ژنێکدا پیاوێکتان بەردەدەمەوە،
لە لووتکەوە گۆڕان دەستپێدەکات
لێرەدا زۆرداریی سەوز دەبێت
لێرەشەوە "با"ی ڕمانیان هەڵدەکات،

پۆستی ژمارە (330)
هەینیی ڕێکەوتی 17.08.2007 کاتژمێر 16:27

گوێت لێدەگرم وەک جریوەی پاساریی بەیانییەک
تێتدەڕوانم، ڕوونیت وەک زنەی چاوی کانییەک،
بەم بەیانییە گوێ لە خوڕەی ئاوی دوشەکەت دەگرم
میوانێکم لات، فرمێسکی دەیان ساڵەم بە دەسڕی ئاوریشمی نیانت دەسڕم،

پۆستی ژمارە (331)
شەممە ڕێکەوتی 18.08.2007 کاتژمێر 21:41

شاعیر بەبێئەوەی مەرگی دی بێت، ئاشقیەتی
بێئەوەی جارێک پیاسەیەکی لە مەرگدا کردبێت عەوداڵیەتی،
شاعیر هەژارە لە سەرمایەدا
دەوڵەمەندە لە وشەدا
جوامێرێکە کراسی پیتی لەبەردایە،
مەرگی ئەو مەرگی ژانەکانیەتی نەک خۆی
لە مەرگییەوە وشەکانی سەری بڕاوی ئەون و شیعرەکانی لاشەی
لە مێژووەوە بۆ ئایندە شار بە شار دەگەڕێن بۆی،

پۆستی ژمارە ( 332)
یەکشەممە ڕێکەوتی 19.08.2007 کاتژمێر 11:22

بەیانییەک بەرلەوەی چاوهەڵبهێنیت

بەرلەوەی دەست بە پرچی ئالۆزکاوتا بهێنیت،
وەک "با" لە باوەشت دەکەم
بۆ ماچی پەلاسی ناو دەمت، قۆڵەکانم وەک ملوانکە لە ملت دەکەم،
تینووم وەک درەختی سووتاوی دارستان بۆ باران
بۆ نیگای جوانییت، بۆ ئاوێزانت شەوان،
کافێیەک پێکەوە دەخۆینەوە
نیگای ڕووخساری یەکدیی دەکەین
ئەشق لە گلێنەماندا دەخوێنینەوە،

پۆستی ژمارە (333)
دوو شەممە ڕێکەوتی 20.08.2007 کاتژمێر 09:35

بە شەقامی گڕگرتوودا بڕۆ و تەماشای بەرپێی خۆت بکە
بە سەردەمی غەدر و تیرۆردا بڕۆ و چەترێک بۆ شکۆی خاکت هەڵبدە،
ئا لێرەدا مرۆڤی پاک بۆ تۆ مردووە
لەم سەرایەدا دەیان ساڵە سەرانی ناپاک سکێچی تۆیان لە بەغداد بە دینار نەخشکردووە،
تۆی فەرامۆشکراو، تۆی تەنیا باڵ
بە فوارەی خوێنی جەستەتەوە
بە گڕی تەقینەوەکانی ڕۆژتەوە
ڕاماندەچڵەکێنیت شار بە شار گەڕەک بە گەڕەک ماڵ بە ماڵ،
چوار وەرزەی ساڵ لەلای تۆ بارینی گڕ و تەقینەوە باڵا دەستە
خاکێکی سووتاویت، ئەوەی ئێمە بۆ تۆ نەمان بێت "هەست"ە،
هەست، هەستی مرۆڤایەتیی
هەست، هەستی شانازیی و شکۆی نەتەوایەتیی،
دادوەریی لە وڵاتی خوێن و مەرگدا، هەرگیز بۆ تۆ نەبووە
مافی تۆ لە مەچەکی پۆڵایینی خۆتدایە
ئەوەی ڕۆژێک دۆستی ڕاستەقینەی تۆ بووبێت شەڕ بووە،
بە ژمارەیەک تۆ ئازاد نابیت
لەژێر دەستی ئەم سەردارانەدا هەتکدەکرێیت
لێ هەرگیز تۆی شیرین بە فەرهادی دڵی پێشمەرگە ناگەیت،

پۆستی ژمارە (334)

سێ شەممە ڕێکەوتی 21.08.2007 کاتژمێر 09:17

ئازادییم دەوێ
بەسەر هەزارەها لاشەدا هەنگاو دەنێم
ژانێکم لەوەتەی هەم شانم لە شانی ئازار دەکەوێ،
لەگەڵ کلووی سپیی بەفردا دەبارێم
لەگەڵ تاوە تەرزەی پاییزدا درەخت بە درەخت چڵ بە چڵ
بۆ گەڵایەکی گازەڵیی بەجێماو دەگەڕێم،
لە ڕەهێڵەدا تنۆکێکم
لە هەورە بروسکەدا هاوارێکم،
لە نۆتەی نەورەسێکدا دوعایەکم، دوعا بۆ دوعا دەکەم
لە پەلکەزێڕینەیەکدا ڕەنگێکم باسی مەرگی شەوبۆ* دەکەم،
لە تەنیاییدا هاوارێکم پڕ بە گوێی کەڕی پیاو
ملوانکەی هەزار دەنکە ژانی بەناز* لە گەردن دەکەم،

پۆستی ژمارە (335)
چوار شەممە ڕێکەوتی 22.08.2007 کاتژمێر 22:34

ئاخۆ ئەم تووڕەییە ڕۆحی شەکەتی کام ڕێبوار دەکاتە قەقنەس
بولبولی ژانی کێ دێنێتە خوێندن وەک دیلی قەفەز،
ئەم بروسکەیە
ئەم ناڵە گەورەیە،
ئەم هەورە ڕەشانە شەڕی کێ دەکەن؟
ئەم سووپای "تاو" و ڕەهێڵانە هێرش بۆ سەر کام قەڵا دەبەن؟
ملی درەختی هیچ دارستانێک نەما نەیشکێنیت
سنگی ماندووی هیچ ڕێگایەک نەما هەڵینەتەکێنیت،
دەتەوێت ئەم خاکە بکەیت بە دوو پارچەوە
بە تەوری بروسکە و هەور، سەری شار و گووند پانبکەیتەوە،
بەم ڕێگایەشدا تێدەپەڕم  ترسم لە گرمە و ناڵەت نییە
دێم بەرەو شار و کۆڵان و ماڵی خۆم، باکم بە بروسکەکانت نییە،
دێم بە ڕەهێڵە و "با" و بۆراندا ڕێگا دەبڕم
پۆستێک دەنووسم پڕ لە بوێریی، ئەو دەستەی دێت بۆ کووژانەوەم
بە تیغی وشە دەیبڕم،

ئاشقی خاک و ئاو و نیشتیمانی خۆمم
تارییکیی نامشارێتەوە، من ڕووناکییم، من مۆمم،

پۆستی ژمارە (336)
پێنج شەممە ڕێکەوتی 23.08.2007 کاتژمێر 08:32

وەک هەنگی تینووی ماچی پەلاسی گوڵ
وەک شپرزەیی و خێرایی لێدانی دڵ،
دەگەڕێم لەم شەقامەوە بۆ ئەو کۆڵان
لە دەروونی ژێرزەمینەکانەوە بۆ باخچەی گوڵان،
بۆ چەپکێ گوڵ دەگەڕێم نەمگەزێ
وێڵی مەدالیایەکم شایستەی ئێخەی سپیی تۆ بێ،
گەردنلغێکم دەوێت درەوشاوەی بلوری گەردنی تۆ بێ،
وەک ماخۆلانگرتوویەک، پێکانم بەرەولای تۆ دەمهێنن
پەنجەکانم تەپەتەپ لە پەنجەرەی ڕۆحم دەدەن
حەزێکی نووستووم لە خەو هەڵدەستێنن،
دێوانەیەکی لە مێژوودا بەجێماوم
لەو ڕۆژەوەی بینایيم نابینایە
گریانی بەیانیانی نەورەسێکی باڵکراوم،

پۆستی ژمارە (337)
هەینیی ڕێکەوتی 24.08.2007 کاتژمێر 13:37

دەنگێکم لەودیوو دیوارەکانی بێدەنگییەوە
پەروانەیەکم ڕۆشنایی هاوڕێمە
چ باکم بە سووپای دوژمنە
لەم تاریکستانەدا ژنێک چرامە،

پۆستی ژمارە ( 338)
شەممی ڕێکەوتی 25.08.2007 کاتژمێر 04:23

شەکەتم
بە تارییکییدا ڕێگادەبڕم، نانی تەویڵی خۆم دەخۆم
کرێکارێکی ئازاد و بێ منەتم،
ناندەری من بازوومە
گەڕیدەیەکم لەدەست ئازار هەڵدێم
ئەم هەوارەم لا مۆڵگەی شوومە،
بەرەو لات دێم ئەی تروسکایی ژیانی من
ئەی قەڵای مانەوەی من بەپێوە
ئەی شمشێری شەڕی هەق، ئەی ژنی دەریا و ئۆقیانووسەکان
ئەی قەڵغانی من،
ژیان لەگەڵما بەشبکە، قاقام بۆ تۆ
خەم و گریەی تۆش بۆ من،

پۆستی ژمارە (339)
یەکشەممە ڕێکەوتی 26.08.2007 کاتژمێر 14:00

هیچ سووپایەک نەیبەزاندووم، هەتا هەڵبێم
هیچ شمشێرک لەسەر گەردنم ڕانەوەستاوە، هەتا گۆرانیی بۆ دەستەڵات بڵێم،
بێدەنگم، چونکە بیردەکەمەوە
ئازارێکم بەدەر لە دەرگا قەدەغەکان هیچ گرێیەکی دی ناکەمەوە،
چەکی من وشەیە نەک کێرد و چەقۆ
ئەی دەستەڵاتی هەژار لە ئەقڵ و دەوڵەمەند لە خوێندا
شیعرم هی خەڵکە و گەردنیشم هی تۆ،

پۆستی ژمارە (340)
دوو شەممە ڕێکەوتی 27.08.2007 کاتژمێر 05:30

بەقەد قووڵاییی خۆت بیرت لێدەکەمەوە
مرۆڤێکی بێدەستەڵاتم گرێی نهێنییەکانتم بۆ ناکرێتەوە،
دەمەوێت ئەو کاتەی دەمرم تێکەڵت بم
دەمەوێت ئەو کاتەی دەبمە خۆڵەمێش ملوانکەی هەزار دەنکەی گەردنی شەپۆلت بم،

لەو ڕۆژەوەی تۆ دەناسم
خەمەکانم بە بزماری هێمنیی تۆ دەسمم
لە یەکەم مەلەم تێتدا تێگەیشتم، کە تۆیت کەسم،
خۆشەویستم نیگەرانە، کە چارەی دەردم ناکات
تۆ لوقمانی ڕۆحمیت، تەمەنم بەشی پاداشتی تۆ ناکات،

پۆستی ژمارە ( 341)
سێ شەممە ڕێکەوتی 28.08.2007 کاتژمێر 06:00

خوێندنیان بیرچۆتەوە ئەم کەڵەشێرانە
لە بێدەنگیی ناهەقییدا گەورەترین دەنگی زاڵن ئەم شێرەدارییانە،*
چەندین ڕۆژە دەسووتێنرێن
چەندین ڕۆژە وەک گوڵی بەر "با" دەپروکێنرێن،
دەنگ لە بەردەوە بێت لە ئەوانەوە نایە
هێند ڕەشبینم پێموایە خۆر لەم وڵاتە قەت هەڵنایە،
کیشوەرێکن لە تارییکیی، هەواریان ماڵی شەمشەمەکوێرەیە
ئەی هاوڕێ گیان لێرە نیشتیمان نامۆیەکی بێ لانەیە،

پۆستی ژمارە (342)
چوارشەممە ڕێکەوتی 29.08.2007 کاتژمێر 23:25

لێرە مەرگێکی جوان دەمرم
لێرە دەست و پەنجەی دواهەمیین پۆستم لە خەنەی خوێن دەگرم،
لێرە هێند بیر لە مردن دەکەمەوە بیر لە ژیان ناکەمەوە
لێرە هێند تاڵاو دەچێژم، قوومێک ئاوی ئاسوودەیی ناخۆمەوە،
لەکەنار ئەم دەریایەدا
لەگەڵ سەمفۆنیای گریەی ئەم "با"یەدا،
نیوەشەو درەنگان بیر لە مردنێک دەکەمەوە
بە خوریی وشە نادیارەکان
بە تەنافی شیعرە خەمبارەکان
دەرگا لە مردنێک دەکەمەوە،
مردن ترس نییە لە ژیان

بیرکردنەوە نییە لە جاران،
خەمێکە ئێستا تێیدا دەژییت
نامۆیەکە تەنیاییت دەداتێ و تۆش خەمی پێدەفرۆشیت،
خەمێک ئەو نەبێ کەسی تر لێت ناکڕێت
خەمێک نامۆبوون نەبێت کەسی تر کڕیاری نابێت،

پۆستی ژمارە (343)
پێنج شەممە ڕێکەوتی 30.08.2007 کاتژمێر 21:34

لێگەڕێ با ئەم "با"یە پرچی درێژی خەمەکانم شانە بکات
لێگەڕێ با ئەم دەریایە جۆلانێ بە ڕۆحی شەکەتم بکات،
من بە گریەی بەیانیانی نەورەسەکان دەژییم
من بە "با"ی هەڵکردووی سەر دەریا دەژییم،
نامۆیەکم لە پێستی خۆمدا نا ئاسوودە
لەوەتەی هەم بەدوای بستە زەمینێکدا ڕادەکەم بێهوودە،
زەمینێک، کە خۆشبەختم بکات
نیشتیمانێک، کە بیرکردنەوەم بە خەڵکیی نامۆ نەکات،
نامۆیەکم لەوەتەی هەم بۆ هاوڕێیەک دەگەڕێم
ئاگری هیچ ژانێک نەما نەمسووتێنێ، جارێک چییە بەختیاریی نەهاتە سەر ڕێم،

پۆستی ژمارە (344)
هەینیی ڕێکەوتی 31.08.2007 کاتژمێر 23:12

ناپاکییەکی ئاشکرا
دەرگایەکی بە ڕووی خوێندا ئاوەڵا،
لە هەموو پەنجەرەیەکی مێژووەوە هاواری غەدرێک
لە هەموو دەرگایەکی ئایندەوە دەنگێک،
هەموو ساڵێک لەم ڕۆژەدا پۆستەچییەک لە مێژووەوە دێت
ئایندە دەباتەوە بۆ مێژوو و خوێنەکان دەکاتە کراس و لەبەری دەستەڵاتی دەکات
ئەو دەستەڵاتەی هێشتا خوێنی گەردنی من بە سەری پەنجەکانیەوەتی

ئەو دەستەڵاتەی ئیمڕۆ بڕیاری لەسەر مان و نەمانی من دەدات،

پۆستی ژمارە (345)
شەممە ڕێکەوتی 01.09.2007 کاتژمێر 20:34

بمکووژە ئەگەر بە هەق خۆشتدەوێم
ئەگەر بەم دەردەوە تەماشام بکەیت، دەبمە سێبەر هەتا مەرگت لێت نابمەوە
من چکمەجەیەکی داخراوم زۆر هەوڵیاندا بمشکێنن، لێ بە هیچ کەس نەکرامەوە،
بمکووژە و خۆڵەکەم بکە دەریاوە با ژانم لەگەڵ خۆمدا بمرێت
نامەوێت ئازاری ڕۆحم بدەم، کە کەسێک شک نەبەم دڵۆپێ گریەم بۆ بسڕێت،

پۆستی ژمارە (346)
یەکشەممە ڕێکەوتی 02.09.2007 کاتژمێر 23:02

تۆ خودایت یان فریشتەیەکی ئەویت؟
تۆ تەنها منداڵێکی ساوایت یان ئارامیی ڕۆحی شەویت؟
دەیان ساڵە کەس وەک تۆ ڕۆحی زامداری لە ئامێز نەگرتووم
ژانێکی لەپێکەوتووم کەس وەک تۆی ساوا دارە دارەی پێنەکردووم،
چاوی گەورەکان کوێرن، چاوی تۆی ساواش چاوی فریشتەیەکە
دڵی گەورەکان پیسن، دڵی تۆی ساواش کلووی بەفر، شاباڵی بێگەردی پەرییەکە،
دەمدوێنی بە ئاوازی هەستە و بڕۆی خۆت
من بزەت دەدەمێ تۆش "با"ی مەرگ لە ڕۆحما ڕاوەدەنێیت
من لایلایەت بۆ دەکەم تۆش بۆ کەروێشکە خەوێک سەرت بە سنگمەوە دەنێیت،
من باوەشت دەدەمێ تۆش حەڵوا و گەزۆی پێکەنین
بۆ تۆ نەبێت کەسی دی هەست بە خەمبارییم ناکات؟
دەڵێی دڵێکی دیلی دوو جەستەین
ڕۆحێکی کەرتکراوی دوو دونیاین
کەچیی لە باکوورەوە بۆ باشوور
لە خۆرهەڵاتەوە بۆ خۆرئاوا هەست بە ژانی یەکدەکەین،

ئیمڕۆ تۆ منت لەسەر لێواری مەرگ هێنایەوە
ساوایەکی خودایی بە من نەبێت گرێی دڵت بە کەسی تر نەکرایەوە،

پۆستی ژمارە (347)
دوو شەممە ڕێکەوتی 03.09.2007 کاتژمێر 08:30

چاوەڕوانی پەڵەیەک هەورم بێت ئەم پۆستانەم بۆ بەرێت
پەڵەیەک هەوری سپیی سپیی، کە خەمی ساڵێکم لە گلێنەی چاوەکانیا بۆ هەڵگرێت،
مەگەر بەس ئەو بتوانێت گریانی من لە داکردنیا نیگار بکات
مەگەر بەس ئەو بتوانێت هاوارم وەک ملوانکە لە ملی ڕەشەباکەی سلێمانیی بکات،
ئەو شارەی جارێک چییە دەستی تەوقەی نەگووشیووم
ئەو شارەی تێیدا لەدایکبووم، کەچیی ئێستا هەر دەڵێی قەت نەیدیووم،
نامۆیەک نیم گریانی خۆمت لە پۆستێکدا بۆ بنێرم
تووڕەیەکم دەمەوێت لێرەوە ئایندەت پێبسپێرم،

پۆستی ژمارە (348)
سێ شەممە ڕێکەوتی 04.09.2007 کاتژمێر 09:20

بەم ئازاری گەردنەوە دەمەوێت ئاوڕێکت لێبدەمەوە
بەم ژانە ڕەقبووەی ملمەوە
بەم هەموو خەمە مۆرانەوە، کە دەڵێی شاتووی وەریووی سەرڕێم
ئاوڕت بۆ دەدەمەوە ئەی کوردستان
ئەی ترپەی لێدانی دڵ، ئەی گلێنەی هەردوو چاوان
دەمەوێت وەک دڵدارێ بتنووسێنم بە خۆمەوە،
با ئەم جەللادانە بە شیشی خەمەکانی تۆ بمبرژێنن
با چقڵی دڕی ئەم باخانەت بینابیم بۆ هەتا هەتایە دەربهێنن،
با ئەم هەموو جلە کەتافییانە پێمپێبکەنن
دەمی لە تینوودا وشکهەڵاتووی من هێزی وەڵامدانەوەی نییە
دەستی من دیلی کەلەپچە و زنجیرە
با ئەم هەموو گوڵەمێلاقانە چەپڵە بۆ فڕینی پەپوولە لێبدەن
با ئەم هەموو تفەنگانە سەرقاڵی تەقاندن بن

شاعیرێکی ڕووت و بێ شمشێرم، بەدەر لە وشە من چیی ترم لەبیرە؟

پۆستی ژمارە (349)
چوارشەممە ڕێکەوتی 05.09.2007 کاتژمێر 09:05

دەبینم ئەم خاکە خوێن لەبەر هەموو بستێکی بەژنی دەڕژێت
گیاندارەکانیش بۆی دەگریین
کەچیی تنۆکێ ئەشک چییە لە چاوی برسیی ئێوەوە نابینرێت،
دەتکووتن وەک دۆشەکی هەڵواسراوی ساڵ، بە بۆمبا
ئەم هەموو چاوە تەماشات دەکەن، کەسێک نییە بانگی باوەش گرتنەوەت بۆ بدا،
ئەوەی هەستی بۆت هەبێت خۆشیدەوێیت
ئەوەی تەنها بیرلەخۆی دەکاتەوە هەتکت دەکات بۆ فرۆشتن دەیەوێیت،
مرۆڤ لە خراپە دروستکراوە
خووەکەشی ناو دەنێت دایەن*1
خووی ئەمان خۆویستییە، هێلکەیەکی پیسن هەڵنایەن،
ئەی دەستەڵات
ئەی سەرکووتکەر
ئەی بکووژی ڕاستیی
ئەی وێرانکەری وڵات،
بۆچیی دەتەوێت لە هەموومان و لە ڕوانگەمان دووربکەویتەوە
من نانووسم هەتا ئێوە بەدڵتان بێت
ئێوە پێویستە شتێک فێربن*2
خاکی خۆتان خۆشبوێت
وەک شێر ئازا، نیان وەک نیگای گوڵ بن،

*1: لاپەڕە 907
Die Welt als Wille und Vorstellung: Arthur Schopenhauer. Seite, 907

* 2: لاپەڕە 549 کۆپلەیەک هۆنراوەی یۆهان ڤۆڵفگانگ ڤۆن گووتە، ئارتوور شۆپنهاوەر کردوویەتی بە دەستپێکی لێکۆڵینەوەی ( نیوەی یەکەمی فێربوون)
Die Welt als Wille und Vorstellung: Arthur Schopenhauer. Seite, 549

پۆستی ژمارە (350)
پێنج شەممە ڕێکەوتی 06.09.2007 کاتژمێر 10:25

لە هەر گۆشەیەکدا ڕادەوەستم، وەک ئەوە وەهایە، کە ڕووابم
نامۆیەکم لە خەمی ڕۆژانەی خۆمدا وێنەی گوڵی زیز و سەرابم،
ترسم هەیە هۆشیاریی لەکیسبدەم
وەک مرۆڤێکی پیر و شەکەت دارە دارە بە ئەقڵ و پێ و هەنگاوم بکەم،
پیر نیم سەختیی ژیان لێیداوم
گەنجێکی ڕۆح ڕەنجاوم، نیگای هەر شوێنێک دەکەم
ناهەقیی مرۆڤ دێتە بەرچاوم،
لێگەڕێن با لە کەنار ئەم دەریایەدا بمرم
شیعرێکی لە کۆمەڵ تۆراوم، دەمەوێت گریەم بە ئاوریشمی شەپۆل بسڕم،
دەیان ساڵە منی زیندوو لەناوتاندا مردووم
چاوەڕوانی مەرگم دەکەن هەتا لەدایک بم
وتارێکم ڕەشەبا بۆ دوورگەی تەنیایی بردووم
دەتانەوێت بیمەوە، بۆ پیاسەیەک هاوڕێی ستایشی ئێوە بم،
چاوەڕێ نیم دەستخۆشییم لێبکەن
شیعرم چرایە، دەبینم شەوانە
لە تاریکستانی ژیانتاندا هەڵیدەکەن،

پۆستی ژمارە (351)
هەینیی ڕێکەوتی 07.09.2007 کاتژمێر 02:23

بەم دوانیوە شەوە درەنگە هەستە لە خەو گوڵم
مرۆڤێکی شەکەت و ماندووی ژیانم
یەکپارچە کێڵگەی خەمە خاکی دڵم،
هەستە، سەرێک بخەمە سەر سینەی نەرمت
با  باسکت جۆلانەی ڕۆحم بێت

هەناسەم بگات بە خونچەی دەمت،

پۆستی ژمارە (352)
شەممە ڕێکەوتی 08.09.2007 کاتژمێر 22:08

جوانترین دیارییت بۆم وەرزێکی پڕ وشەیە
پاییز لەبەر دەرگا ڕاوەستاوە، سەدان "با" و بارانی شیعری پێیە،
لە سنگی داپۆشراوی درەختەکان دەڕوانێت
لە بنی پێ هەتا تەوقە سەریان ڕادەمووسێ ئەگەر بۆی بلوێ، ئەگەر بۆی بکرێت،

پۆستی ژمارە (353)
یەکشەممە ڕێکەوتی 09.09.2007 کاتژمێر 21:35

قومرییەک لە ڕۆحما گریەی بوو
هەورێک لە دڵما پەنگیخواردبوو
"با" بە سەری پەنجە تەپە تەپ لە شووشەی پەنجەرەکەمی ئەدا
پۆستێکیان پێبوو
کە خوێندمەوە هەواڵی چەشتنی ژانێکی تێدا بوو،
ژان بە گریانەوە هاتە ژووری
ڕووخساری بە خوێنێکی ئاڵ شووشتبوو
منداڵێک بوو پێنج ساڵە
لە پەپوولەیەک دەچوو ئەو دەمەی لە سووتاندا شەلاڵە
لە بێچووە چۆلەکەیەک دەچوو، ئەو دەمەی باڵەکانی لە هەڵفڕین بەتاڵە،
کوڕەکەم ئێستانێ ژانێکی ڕۆح بە زریکە سمراوە
ڕەنگاڵەیەکە لە سەمای خوێن هەڵکێشراوە،
کوڕم ئەم خوێنەی تەوێڵت چییە؟
ڕۆڵەم ئەم گریانەت سپیی سپیی بە وێنەی پەرییە،
ڕۆحت سپیی وەک کلووی بەفر
ڕووخسارت سوور، لێ شیرین وەک شەکر،

چ شەیتانێ دەیەوێت جوانیی ڕووت تێکبداتەوە؟
تۆ ، کە هێشتا پێنج بەهارییت ئێرەیی بۆ ڕەنگ و ڕووت دەشواتەوە؟
سەرت بنێ بە سنگمەوە باوانەکەم
بۆ تۆیە دڵ و گیان و ژیانەکەم ،
بەرگەی تەماشای ئەم ژانەت ناگرم
بێهێزێکم فرمێسکەکانم بە دەستەسڕی هەناسەم دەسڕم ،
تۆ هەنووکە برینێکی گەورەیت لە ڕۆحما
هەورێکیت هەتا مەرگم گریان دەڕوێنیت لە چاوما ،
ئەم ژانە گەورەیە لە دڵی بچووکتا جێگای نابێتەوە
بەم پێنج مۆمەی تەمەنتەوە بۆ ئازار ژیانت بنووسێتەوە؟
بۆ ئەوەی تۆ وەک من ژان نەتکووژێت
دەبێت درەختی تەمەنت گوڵ و خونچەی خۆشیی بگرێت ،
منداڵێکی بەختەوەر بیت خۆری قاقات هەمیشە گەش بێت ،

پۆستی ژمارە (354)
دوو شەممە ڕێکەوتی 10.09.2007 کاتژمێر 21:03

ئیمڕۆ دڵم هەرمێیەکی گووشراوی خەمی تۆیە
ڕووخسارم وەک دارتوویەکی وەریوو
ڕەنگی وتەم وەک نانی جۆیە ،

پۆستی ژمارە (355)
سێ شەممە ڕێکەوتی 11.09.2007 کاتژمێر 21:50

دەنگ ڕزگارمان دەکات
وشە سکێچی ژیانمان دەکات ،
وشە چرایە
ڕێبوارێکە ماڵە و ماڵ دەکات ،
وشە لە هەمووماندایە

وشە چاوە بەبێ پەنجەمان هەڵنایە،
وشە نۆتەیە بەبێ زمانمان دەرنایە،
ئەوەی بێ زمانە بێ وشەیە
ئەوی بێ وشەیە بێ پەنجەیە،
زۆردارە ئەو پاشایەی ملی وشە دەپەڕێنێت
جەللادە ئەو سەردارەی بۆ کووشتنی وشە دەمانچەی لە کیف دەردێنێت،

پۆستی ژمارە (356)
چوارشەممە ڕێکەوتی 12.09.2007 کاتژمێر 22:58

وتە کەمبوون، کە ئازاریان نەدابم
کەمبوون، ئەوانەی بە چەقۆی وشە لە ناوەڕاستا کەرتیان نەکردبم،
منی مرۆڤ، ئازارچێژی دەستی مرۆڤم
شەڕانیی نیم، کەچیی شەڕ ئەکرم و هێز ئەفرۆشم،
کرێکارێکی بێ ناونیشانم، سەرمایەدار ئەمژیەنێ
هیچم نییە پێی بفرۆشم بەدەر لە وزە و توانام
بێکەسێکم، دەستێک شکنابەم بگاتە هانام،

پۆستی ژمارە ( 357)
پێنج شەممە ڕێکەوتی 13.09.2007 کاتژمێر 20:17

بەم بولێڵە وەرە ڕۆحم ڕاژێنە
خۆشیی بکە بە گەرووما، ژان لە ڕۆحما دەربێنە،
بمدوێنە بەم نۆتە ناسکانە
بملاوێنە ئەی یار بە حەڵوا و گەزۆی ئەم وشانە،
وەرە با پێکەوە نامەیەک بۆ پاییز بنێرین
ماچی "با"ی بەیان بکەین
بە چرپە زیزبوونی گوڵ لەم وەرزەدا بدوێنین،
با ئیمشەو بچینە دیدەنی مانگ و ئەستێرەکان

پێکێ شەراب  لەبەر دامێنی دەریادا بخۆینەوە
شنەی شەماڵ بکەینە نیشتیمان،

پۆستی ژمارە ( 358)
هەینیی ڕێکەوتی 14.09.2007 کاتژمێر 21:30

با ئەم پاییزە سەر بنێین بە سەری یەکەوە
وەک درەخت و "با"  باوەش بۆ یەک بکەینەوە،
جارێک پەڵاسی ناو دەمت ماچدەکەم
جارێکیش بە سەری پەنجە ڕووتتدەکەمەوە،
منی تەرە لە تۆ زیاتر کێم هەیە بێت بەلامەوە؟
نامۆیەکم بە ئاوی ئەشکم ڕۆژانە زامەکانم ئەشۆمەوە،
بەتەنیا تۆ شکدەبەم
بەتەنیا تۆ پشتت ناوە بە پشتمەوە
ئاخر بۆیە شەوێک شکنابەم بۆت نەبم بە شەم،

پۆستی ژمارە (359)
شەممە ڕێکەوتی 15.09.2007

گوێم لە دەنگی پێی پاییزە
چاوم پڕ خەمی درەختی زییزە،
کزەیەک ماچی ڕوومەتی ڕیشنم دەکات
تنۆکی باران ڕووی پۆستێکم تەڕ دەکات،
باران نامەی نیشتیمانم لە بارینی خۆیدا بۆ دەخوێنێتەوە
"با"یەک دێت هەتککردنی سلێمانییم بۆ دەگێڕێتەوە،
ئەم بارەشەی ئێرە دەستەخوشکی "با"کەی سلێمانییە
کیژێکی سەرشێتە لە میوانییدا کاتی بۆ نییە،
ئەم کەلەپۆیەی ئێرە وەک لای خۆمان چاو بازە
ئاشقی ڕووتبوونەوەی ئێوارەیە، لە نیگادا وەک گوڵی ڕازە،
لەگەڵ زەردەپەڕدا نامەیەکت بۆ دەنێرم ئەی نیشتیمان

پۆستێک خەمەکانت بدوێنێت
پۆستێک ڕوو سوورت بکات نەک بتگریەنێت،
پۆستێک پڕ وشەی بوێر
وەک چریکەی هەڵۆ، پڕ دەنگی دلێر،
پۆستی ژمارە (360)
یەکشەممە ڕێکەوتی 16.09.2007 کاتژمێر20:57

ڕۆژانەم بە تاڵی سپیی لە قژی قەترانما دەنووسمەوە
ئازارێکی گەڕیدەم، بەر "با"ی هەر شارێک دەکەوم دەکوولێمەوە،
ئاشقێ بووم، وەک پەڕەسێلکە هێلانەم بە تاقی دڵەوە چێکردبوو
تەنیایەک بووم وەک درەختی گڕگرتوو قوومێک ئاو چییە لە دەورم نەبوو،
هەنووکە خەمی سالآنی ڕابوورد هەتا ئێستا دەمگریەنێ
بۆ هەرکوێ بچم شەختەی ژانی ڕۆژانی تۆ دەمتەزێنێ،
کەی ئەم ژانە لێم دووردەکەوێتەوە
مرۆڤێکم لە برییندا بە وێنەی شاتوو مۆرە ڕەنگم
ئازارێکم هێندە پیر وەک تەپڵی دڕاوە هەناسە و دەنگم،
کەنگێ هەناسەیەک بۆ ژیان لەم کەنارەدا ئەدەم
شاعیرێکم لەوەتەی هەم تەنیا و تەنیا هەر لە بۆ خۆم دەفی خەمم لێئەدەم،
لە قاقادا دەورم هەمیشە زڕەی پێک و بەزم و خۆشیی بوو
لە گریەدا وەک گوڵی ژاکاو تەنیا و دوورە دەست  تاکە پەڕێکم ڕەنگی نەما بوو،

پۆستی ژمارە (361)
دووشەممە ڕێکەوتی 17.09.2007 کاتژمێر 10:08

ڕۆژانە لەبری نان خەم دەخۆم
ئەی خەمی لەبن نەهاتووی ژیانم
تۆ ئەو ژانەیت لەگەڵمدا لەدایکبوویت، تۆ منیت، من تۆم،
بۆ چرکەیەک چییە لێمناگەڕێیت
هەرکات بێم بمەوێت بتگرم لەدەستم هەڵدێیت،
تەپکەی قاقا و داو و تەڵەی سەما و خۆشییم بۆ نایەتەوە هەر نەمگرتیت

چاوەڕێبکە ئەو ڕۆژەی تۆ دەمدەیت بە زەوییدا  لەگەڵ مندا خۆشت مردیت،

پۆستی ژمارە (362)
سێ شەممە ڕێکەوتی 18.09.2007 کاتژمێر 08:38

نۆ مانگە خۆشمدەوێیت
هەموو ڕۆژێک لەگەڵ هەموو خەم و خۆشییەکدا دەمەوێیت،
خۆشمدەوێی لە گریاندا، لە پێکەنییندا
لە هەبوون و لە هەژارییدا
جارێک سەرم دەنێم بە سەرتەوە بۆ گریان
جارێکیش دەستم لەناو لەپی دەستدایە لە بەزم و خۆشیی دڵدارییدا،
پیاسەیەکت دیاریی دەکەم لە کەنار دەریادا
دەستم لە کەمەرت دەئاڵێنم، "با" کۆلارەی پرچت هەڵدەدات
دوو ئاشقی تەڕەو ماندووین گۆرانیی دەڵێین بە باڵای ئەم یادەدا،

پۆستی ژمارە (363)
چوارشەممە ڕێکەوتی 19.09.2007 کاتژمێر11:20

خەمبارم بە وێنەی پاییز
لەم شارەدا کەسێک نابینم وەکی من دڵتەنگ و زیز،
کێ هەیە ئازاری منی نەدابێت؟
کێ هەیە تەنها جارێک کۆتری دڵی منی لەسەربانی دیدارێکدا هەڵنەفراندبێت؟
ئەو "با"یەش قژی ئاڵۆزکاوم دێنێت و دەبات دەمتۆرێنێت
بە چرنووک ڕووی خەمبارم دەشێوێنێت،
ڕووخساری گریاناویی من پێشانگای خەندە و بزە نییە
چاوی پڕ فرمێسکی من مەزادخانەی هەست و خۆشیی نییە،
پاییز هەمیشە میوانی ڕووخسارم بووە
شاعیرێکم لە چوار وەرز سێ وەرزی ژیانم، وەرزی خەم و گریان بووە،

پۆستی ژماره (364)
پێنج شەممە ڕێکەوتی 20.09.2007 کاتژمێر 23:40

ئاسمانێکی ڕەساسیی
فڕینی باڵندەکان لە هەوادا بە وێنەی ماسیی
سەمای نەورەسەکان لەگەڵ "با"دا
تابلۆیەکە دژ بە شەڕ
گۆرانییەکە بۆ ئاشتیی،
لەو تروسکەی ئاسمانەوە دەنگێک دێتە گوێم
مۆسیقایەک دەبیستم لەم تیاچاڤی سەردەمی دزیی و گەندەڵییەدا
ڕووناکدەکاتەوە ڕێم،
ڕێی من ڕێی ئازادییە
کاروانێکە سەخت و دژوار
ئەوی بیەوێت هاوڕێم بێت، باکی بە تووڕەیی دەستەڵات نییە،

پۆستی ژماره (365)
هەینیی ڕێکەوتی 21.09.2007 کاتژمێر 12:00

بەو تروسکەی ئاسمانەوە سەما دەکەن
کۆمەڵێک نەورەسی نەغمە غەمگیینن، دوعا بۆ مەرگی منداڵێک دەکەن،
دەیان باڵندەی پڕ نهێنین بە دەنووک لە پەنجەرەی تەڵخی ئاسمان ئەدەن،
ئاخۆ کێیە لەودیوو شووشەی پەنجەرەی ئاسمانەوە قاقا بە تەڕبوونی ئێمە پێدەکەنێت؟
ئەوکاتانەی لە ژێرزەمیینی ماڵەکانمانەوە هەتا نهۆمی یەکەم نقوومی لافاو دەبێت
ئەو کاتانەی منداڵێکی بچکۆلانەی پێنج ساڵانە لە خنکاندا هانایەک نییە دەستی بگرێت،
ئێوە بەو تروسکەی ئاسمانەوە تاکە شایەتی مەرگی دەبن
بارینی بارانتان پێڕاناگیرێت، لێ بە هاوار ڕووخساری گریاوی من دەسڕن،

پۆستی ژماره (366)
شەممە ڕێکەوتی 22.09.2007 کاتژمێر 09:17

زەردەشتییانە لە نیوەڕۆدا بیر لە تۆ دەکەمەوە
بە ستوونیی لەگەڵ تیشکی خۆردا بیر لە گۆشە تاریکەکانی ڕۆژ دەکەمەوە،
لەگەڵ نووسینی دواهەمین پۆستدا
هەموو سەرە کاتژمێرێک یادی ساڵێک دەنووسمەوە،
ماڵئاوا ئەی ساڵێک لە تەمەنم
ئەی بەختەوەرییم لە هەر ڕۆژەی پۆستێکدا
ئەی دوای مەرگم چرای ژیینم،

# کۆتاییی